# ووتەکانی

## ئيمام ماليك و شافعي و احمد

نوسينى:

دەریای سەلەف

# كتێبی

له ووتەكانی ئیمامی مالیك و شافعی و احمد.

{نوسینی دەریای سەلەف}

**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ**

- **كورتەیەك لە ژیاننامەی ئیمامی مالیك**

**ناوی ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەسی کوڕی ابی عامری کوڕی عەمری کوڕی حارثی کوڕی غیمانە**

**ناسراوە بە ئیمامی دار الهجرة**

**لە دایك بونی لە ساڵی ٩٣ی کۆچی لە دایك بووە**

**وەفاتی لە ساڵی ١٧٩ی کۆچی وەفاتی کردووە.**

- **كورتەیەك لە ژیاننامەی ئیمامی شافعی**

**ناو و شوێنی لەدایکبوونی ئیمامی شافعی لە ساڵی ١٥٠ی کۆچی لە غەززە لەدایک بووە و زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە یەمەنی بوون**

**ناوی تەواوی محمدی کوڕی ادریسی کوڕی عەباسی کوڕی عوسمانی کوڕی کوڕی شافیعی کوڕی سائیبی کوڕی عبیداللە کوڕی یەزیدی کوڕی هاشمی کوڕی مطلبی کوڕی عبدالمنافی قوڕەیشی تەلەبیە.**

**نازناوی( أبو عبدالله )یە لەساڵی ٢٠٤ی کۆچی لەمیسر کۆچی دوایی کردوە.**

- ## كورتەیەك لە ژیاننامەی ئیمامی احمد

**ناوی احمدی كوری محمدی كوری حنبلی كوری هلالی كوری اسدی كوری ادریسی كوری عبدالله كوری حیان كوری عبدالله كوری انسی كوری عوف كوری قاسط كوری مازنی كوری شیبانە.**

**لە ١٦٤ کۆچی لە دایک بووە**

**٢٤١ کۆچی دوای کردووە**

**نازناوی (أبو عبدالله)یە.**

- ### تێبینی

**ئیمامی مالیك مامۆستای ئیمامی شافعی بووە وە ئیمامی شافعی مامۆستای ئیمامی احمد بووە.**

**(تێبینیەکی کورت لەسەر ئەم کتێبە ئەوەیە هیچ بابێکی تیانیە تەنها قەولەکان نەقل کراوە).**

## له ووته‌كانی ئیمامی مالیك و شافعی و احمد

**١/ ئیمامی مالیك رحمه الله ده‌ڵێ بێگومان ئه‌م زانسته شه‌رعیه گۆشت و خوێنته وه له‌سه‌ری لێپێچینه‌وه‌ت لێ ده‌كرێ له قیامه‌ت (بۆیه) سه‌یركه بزانه له كێی وه‌رده‌گری.**

(الكفاية في علم الرواية للخطيب البغدادي : ( ص ٢١ ))

**٢/ ئیمامی شافعی رحمه الله ده‌ڵێ زانست(مه‌به‌ستی حه‌دیثه) له سێ كه‌س ده‌سووڕێته‌وه مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س سوفیان و له‌یثی كوڕی سه‌عید.**

(التمهيد ابن عبدالبر الجهمي:ص٦٢)

**٣/ ئیمامی احمد رحمه الله ده‌ڵێ گه‌ر ئه‌ثه‌رێكمان نه‌دیبایه له بابه‌تێكدا ئه‌وا شوێن ئیمامی مالیك ده‌كه‌وتین چونكه وته‌ی ئه‌و ئه‌ثه‌رێكه له ئه‌ثه‌ره‌كان.**

(الشرح الصغير : ١/ ١٤٥)

**٤/ ابن وهب ده‌ڵێ گه‌ر من به مالك و الليث نه‌گه‌شتبام ئه‌وا گومرا ده‌بووم.**

(التمهيد ابن عبدالبر الجهمي:ص٦١)

**٥/ عبدالله كوڕی احمد ده‌ڵێ پرسیار كرا له باوكم بۆ زۆر هاوڕێیه‌تی خه‌ڵكی ناكه‌یت ؟**

**ئیمام احمد فه‌رمووی له‌به‌ر ناڕه‌حه‌تی دوای جیابوونه‌وه.**

(سير اعلام النبلاء)

**٦/ ئیمامی احمد رحمه الله دەڵێ کەس قسه به هاوەڵان ناڵێت مەگەر نیەتێکی پیسی له ناخدا بێت.**

**((البدايه والنهايه /ابن كثير ( 148/8))**

**٧/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ الله ﷻ له ئاسمانه عیلمەکەی له هەموو جێگایەکه.**

**(السنه عبدالله بن احمد ١١)**

**٧/ ربیعی کوڕی سلیمان رحمه الله دەڵێت چووم بۆ لای شافعی له نەخۆشی مردنی باسی کتێبەکانی خۆی کرد ئەوەی نوسیویەتیەوە فەرمووی ئاواتمه خەڵک ئەم کتێبانه لەمن فێر ببن و له هیچی باسی من نەکرێت قەت.**

**(تاريخ دمشق (٣٦٥/٥١))**

**٨/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ پێم خۆشه هەر چیەکی ئەیزانم خەڵک له منەوه فێری بن پاداشتی لەلای الله تعالى وەرگرم و کەسیش باسم نەکات.**

**(التبيان في آداب حملة القرآن ٣٦)**

**٩/ ئیمامی أحمد ی کوڕی حنبل به کوڕەکەی ئیمامی شافعی فەرموو باوکت لەو شەش کەسانەیه که له هەموو شەوێك له کاتی بەرەبەیانی دوعایان بۆ دەکەم.**

**(الوافي بالوفيات 1/107)**

**١٠/ ئیمامی مالیك دەڵێ سوونندەت کەشتی نـوح ـە هەرکەسێک سواری سەر پشتی بێ ڕزگاری بووە وە هەرکەسێک لێی دواکەوێت خنکاوە.**

**(ذم الكلام للهروي (٨١))**

**١١/ ئیمامی احمد دەڵێ بەڕاستی ئەوەی لەسەرئێمەیە شوێن کەوتنی ئەوەیە کە ئەوانی پێش ئێمە لەسەری بوون.**

**(مسائل كوسج ٢٦٠٣)**

**١٢/ البويطي دەڵێت گوێم لە ئمامی شافعي بوو دەیوت دەست بگرن بە هاوەڵانی حەدیث لەبەر ئەوەی ئەوان لە هەموو خەڵک ڕاستترن.**

**(طبقات الشافعيين لابن كثير)**

**١٣/ پرسیار کرا لە ئیمامی احمد وتیان کەی ئافرەت سەری دادەپۆشێت بەرامبەر کوڕی بچووک ؟ ووتی ئەگەر کوڕەکە تەمەنی گەیشتە ١٠ ساڵ و تێگەیشت و لێیدرا لەسەر نوێژ نەکردن ئەوکات ئافرەت سەری دادەپۆشێت بەرامبەری کە گەیشتە ١٠ ساڵ.**

**(أحكام النساء : ٥٢)**

**١٤/ ئیمام احمد رحمه الله ئەڵێ هەر کەسێك واز لە نوێژ بێنێت کافرە.**

**(مسائل_ابن_هانيء (١٨٧٦))**

**١٥/ ئیمامی مالیک رحمه الله دەڵێ هەر ماڵێک ناو محمد یکی تێدا بێت ئیللا ڕزق لەو ماڵەدا زیاد دەبێت خێری تێدا زۆر دەبێت.**

**(الفوائد المنتخبة لابن بشكوال (١٧٥))**

**١٦/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ هیمەت بەرزیم لە دوو شت بووە لە عیلم و تیرهاویشتن تاکو وام لێهات لە ١٠ دانە تیر هەر ١٠ دانەم لە نیشانەدا.**

**(تولي التأسيس ٦٧)**

**١٧/ موهەنا بە ئیمام احمدی ووت**

**ووتەکەی اعمش مانای چیە لەوەی ووتی بەشعبە لۆلوئی بەمل و گەردنی بەرازەکان وەمەکەن ؟**

**ووتی مانای ووتەکەی ئەوەیە هیچ پێویست نیە قسە بۆ کەسانێک بکرێ کە شایەن نین.**

**(الآداب الشّرعيّة لابن مفلح (108/2))**

**١٨/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ مژدە بۆ ئەو کەسەی لەسەر سوننەت ئەمرێت مژدە بۆ ئەو کەسەی لەسەر سوننەت ئەمرێت، مژدە بۆ ئەو کەسەی لەسەر سوننەت ئەمرێت.**

**(ذم الكلام للهروي ٥/٧٦)**

١٩/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ قورئان کەلامی الله تعالی یە مەخلوق و درووستکراو نیە.

(کتاب مناقب الشافعي (١/٤٠٧))

٢٠/ أبو عبيد القاسم بن سلام دەڵێ زانست لای چوار کەس کۆتایی پێهات

١ أحمد بن حنبل

٢ على بن المديني

٣ يحيي بن معين

٤ أبي بكر بن شيبة

ئیمام احمد لە هەموویان فەقیهـ ترە.

مقدمة الجرح والتعديل (صـ٢٩٣)

٢١/ پرسیار کرا لە ئیمام مالیك دەربارەی هاوسەرگیری لەگەڵ قەدەریەکان

ئەم ئایەتەی خوێندەوە { وَلَعَبْدٌ مُؤْمِنٌ خَيْرٌ مِنْ مُشْرِكٍ } (البقره ٢٢١)

واتە: بەندەیەکی ئیماندار باشترە لە موشریکێک.

(واتە قەدەریەکان موشریکن)

(الإبانة لإبن بطة العكبري ١٨٦٠)

**٢٢/ ئیمامی شافعی ووتی عەقڵ سنووریکی هەیە کە کۆتایی دێت هەروەکو چۆن بینین سنوریکی هەیە کە کۆتایی دێت.**

**(مناقب للشافعي ص٢٠٧)**

**٢٣/ بە ئیمام احمد وترا خۆشەویستی لەپێناو الله چۆنە؟ فەرمووی ئەوەیە کە تۆ خۆشت نەوێ لەبەر تەماحی دونیا.**

**(طبقات الحنابلة ١/١٣٩)**

**٢٤/ دەڵێم زانستی الله تعالی مەخلوق نیە**

**ئیمام احمد وتی قورئان ووتە و کەلامی الله تعالی یە هەر کەسێك بڵێ مەخلوقە ئەوە کافرە قورئان لە عیلم و زانستی الله تعالی یە ناوەکانی الله تعالی تێدایە زانستی الله تعالی درووستکراو نیە وە الله تعالی دەفەرمووێت**

**{الرَّحْمَنُ} {عَلَّمَ الْقُرْآَنَ} {خَلَقَ الْإِنْسَانَ} {عَلَّمَهُ الْبَيَانَ}**

**قورئان لە عیلم و زانستی الله تعالی یە زانستی الله تعالی درووستکراو نیە ناوەکانی الله تعالی تێدایە.**

**(السنه حرب الكرمانی ٣٦٨)**

**٢٥/ ئیمام احمد لە سەرە مەرگدا پرسیاری لێکرا دوای تۆ پرسیار لە کێ بکەین ووتی عبدالوهاب الوراق**

پێی ووترا عبدالوهاب عیلمی زۆر نیه ووتی ئەو پیاوێكی صالحه كەسێكی وەك ئەو تەوفیق ئەدرێ بۆ پێكانی حەق.

(الورع للمروذي : ٤)

٢٦/ أويس دەڵێ بیستم له خاڵم **مالك** بن أنس وه جەماعەتێك له زانایانی ئەهلی مەدینه له باسی قورئان ووتیان ووتەی پەروەردگاره وه لەویشه وه هیچ شتێك له اللهعزوجل نیـه دروستكراو بێ.

(السنه عبدالله بن احمد ١٢٨)

٢٧/ پێشەوا الربیع ـی كوڕی سلیمان دەڵێت ئیامی **شافعی** به منی ئەوت چەنده خۆشەویستی لەلام.

(آداب الشافعي ومناقبه (٢٠٩))

٢٨/ ئیـمـامـی **احـمـد** رحمه الله دەڵێ پـەنـجـا سـاڵ عیـبـادەتـم كـرد شیـریـنـی ئیـمانـم نـەچـەشت تـا وازم لـه سێ شـت نـەهێـنـا

١ وازم لـه ڕازیكـردنـی خـەڵـكی هێـنـا بـۆیـه تـوانـیـم حـەق بـڵـێم

٢ وازم لـه مـەجـلـیسی خـراپەكـاران هێـنـا و چـوومـه مـەجلیسـے پیـاوچـاكـان

٣ وازم لـه شیـریـنـی دونـیـا هێـنـا ئـیـتـر شیـریـنی قـیـامـەتـم دەست كـەوت.

(سیر اعلام الـنبلاء ١١_٣٤)

٢٩/ ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێ لەدوای تاوانی کوشتن هیچ تاوانێک نیە هێندەی زینا گەورەتر و توند تربێت.

(زاد المسافر ٢٢٩٦)

٣٠/ مالیکی کوڕی ئەنەس رحمه الله دەڵێ هەرکەسێ دەست بگرێ بە سوننەتەوە هاوەڵانی رسول الله ﷺ لێ سەلامەت بێ و ئەمجار بمرێت ئەوا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکاندایە هەرچەندە کەمتەر خەمی هەبێ لە کردەوەکان.

(السنه البربهاری ١٧٢)

٣١/ ئیمامی أحمد ی کوڕی حنبل دەڵێ چیتە سەیری کتێبەکانی شافعی ناکەیت؟

هیچ کەسێک نیە کتێبی نووسی بێتەوە لەوەتەی لە دایک بووم شوێنکەوتوو تر بێت بۆ سوننەت لە شافعی.

(آداب الشافعي ومناقبه (٤٦))

٣٢/ پێشەوا سحنون التنوخي دەڵێ ئیمامی شافعی هیچ بیدعەیەکی نەبووە.

(سير أعلام النبلاء (١٠/٩٥))

٣٣/ بە ئیمامی احمد ووترا کەسانی درۆزن چۆن دەناسی؟

فەرمووی بە مەوعیدەکانیان!!.

(أدب الإملاء والاستملاء؛ ص: [٤٠])

٣٤/ ئیمامی احمد رحمه الله دەڵێ خۆشبەختی بۆ كەسێك خوای گەورە وای كردووە نەناسراو بێت و باس نەكرێت.

(تقدمة الجرح والتعديل)

٣٥/ پرسیار كرا لە ئیمامی مالیك ئایە نوێژ دەكرێ لە دوایی قەدەری ؟

ووتی نەخێر.

(السنه حرب الكرمانی ٢٩٠)

٣٦/ احمد ی كوڕی سلمة النَّيسابُورِيُّ دەڵێت إسحاق ی كوڕی راهەوی بێوەژنێكی هێنا لەشاری «مەڕوە» تەنها لەبەر ئەوەی پیاوە مردووەكەی كتێبەكانی ئیمامی شافعی هەبوو ئەم ژنەی هێنا تەنها لەبەر گرنگی كتێبەكانی ئیمامی شافعی.

(آداب الشافعي ومناقبه (٤٩))

٣٧/ ابن هارونی حەماڵ دەڵێ گوێم لە ئیمامی أحمد بوو دەیفەرموو لەگەڵ ئەهلی كەلام دامەنیشن گەر توابنەوە لە سوننەتیشدا.

(طبقات الحنابلة ٢/٤٠٥)

(ئەهلی كەلام ئەوانەن خەریكی فەلسەفە و مەنطق و ئەو شتانەن كە بریتی نییە لە أثار و پاشماوەی سەلەفی ئومەت).

**٣٨/ ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س رحمه الله ده‌ڵێ هه‌ركه‌سێک هه‌وڵی فێربوونی دین بدات به «المنطق» كه‌لام زه‌ندیق ئه‌بێت.**

**(ذم الكلام و أهله : ٨٧٣)**

**٣٩/ پێشه‌وا الربیع ی كوڕی سلیمان المرادي ده‌ڵێت**

**پیاوێک هات بۆلای شافعی بۆ ئه‌وه‌ی موناظه‌ره‌ی له‌گه‌ڵ بكات له‌سه‌ر شتێكدا فه‌رمووی وازی لێبێنه ئه‌مه ڕێگای ئه‌هلی كه‌لامه موبته‌دیعه‌كانه.**

**ده‌ڵێت وه ئیمامی شافعی گوێی له دوو پیاو بوو قسه‌یان ئه‌كرد له‌سه‌ر عیلمی كه‌لام فه‌رمووی یان ئه‌وه‌یه به‌خێر له‌لای ئێمه دانیشن یان ئه‌وه‌یه له‌لای ئێمه نه‌مێنن.**

**(الإبانة الكبرى لإبن بطة (١/٢١٧))**

**٣٩/ ئیمامی خۆشه‌ویست مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س ده‌ڵێ**

**له‌عنه‌تی الله له عه‌مرو (عه‌مروی كوڕی عوبێد ئیمامی ئه‌هلی قه‌ده‌ر و ئیعتیزال و كه‌لام) ئه‌و ئه‌م بیدعه‌ی كه‌لام ـه‌ی داهێنا ئه‌گه‌ر كه‌لام عیلم بووایه ئه‌وه هاوه‌ڵان و تابیعیه‌كان قسه‌یان تێدا ده‌كرد وه‌ک چۆن له ئه‌حكام و بابه‌ته‌كانی تردا قسه‌یان كردووه به‌ڵام ئه‌مه (یاعنی كه‌لام) باطله و ده‌لاله‌ت له باطل ده‌كات.**

**(ذم الكلام لـ الهروي ٨٧٤)**

**(ده‌ڵێم ئه‌شعه‌ریه‌كانیش ته‌واوی عه‌قیده‌كه‌یان له‌سه‌ر بناغه‌ی كه‌لام دامه‌زراندووه وه عه‌قیده‌كه‌یان له جه‌همی و موعته‌زیله‌كانه‌وه وه‌رگرتووه).**

٤٠/ ئیمامی **مالیک** رحمە الله دەڵێ

هەرکەسێک دینی بە کەلام(فەلسەفە) دەستکەوت زەندیق دەبێ هەرکەسێک ماڵی بە کیمیا دەستکەوت موفلیس دەبێ هەرکەسێک داوای حەدیسی غریبی کرد(کە لەناو هاوەڵانی حەدیس نازانراوبن وە رجالەکانی نادیار بن) ئەوا درۆ دەکا.

(ذم الكلام وأهله)

٤١/ ئیمامی **شافعی** دەڵێ حوکمی من لەسەر ئەهلی کەلام حوکمی عمر ی کوڕی الخطاب ـە لەسەر صبیغ.

(ذم الكلام للهروي (٤/٢٤٦))

با بزانین صبیغ کێبوو

ئیمامی عومەر رضي الله عنه جەڵدی صبیغ التمیمی کرد لەسەر بابەتێك سەبارەت بە قورئان.

(الإبانة الصغرى ٦١)

(صبیغ التمیمی قسەی لە مووتەشابیهەکانی قورئاندا دەکرد لەسەر ئەوە ئیمام جەلدی کردووە)

٤٢/ ئیمامی **أحمدی** کوڕی حنبل دەڵێ هیچ کەسێکم نەبینیوە شوێنکەوتوو تر بۆ ئاثار لە **شافعی**.

(ذم الكلام للهروي (٣/١٥))

٤٣/ الربيع ـى كوڕى سليمان دەڵێت ئيمامى **شافعی** وتی هەر كەسێک ڕقی لە **أحمد** ـى كوڕى حنبل بێت كافر

پێم وت ناوى كوفر ئەدەيتە پاڵ؟ وتی بەڵێ هەر كەسێک ڕقی لە **أحمد** ـى كوڕى حنبل بێت ئینكارى سوننەتى كردووە وە هەركەسێک ئینكارى سوننەت بكات صەحابەى ڕەتكردۆتەوە وە هەركەسێک صەحابە ڕەت بكاتەوە ئەوە ڕقی لە پێغەمبەرە وە هەر كەسێک ڕقی لە پێغەمبەر ﷺ بێت كافرە بەخواى گەورە.

(طبقات الحنابلة (١/٢٩))

٤٤/ لە ابوبكر المروذي وتی پرسیارم كرد لە ئیمامی **احمد** دەربارەى وازهێنان لە نوێژ وتی گەر بڵێت نوێژناكەم دەكوژرێت ووتم گەر وتی نوێژ ئەكەم ؟

ئیمام **احمد** وتی ماوەى سێ ڕۆژ وەكو استتابە مۆڵەت دەدرێت(تەوبەپێكردن) گەر تەوبەى كرد كرد گەر نا دەكوژرێت.

(أحكام اهل الملل صـ٤٧٣)

٤٥/ ئیمامی **احمد** رحمه الله دەیووت ئەگەر كەسێک وتی نوێژ ناكەم ئەوە كافرە.

(أحكام_اهل_الملل صـ٤٧٣|كتاب الردة)

٤٦/ ئیمامی **احمد** دوعاى بۆ أبو زرعة الرازي دەكرد دەیوت الله تعالى سەرت بخات بەسەر ئەوكەسانەى ستەمت لێ دەكەن وە سەلامەتت بكات وە بەڵات لێ دووربخاتەوە.

(الجرح والتعديل لابن أبي حاتم (١/ ٣٤١)

٤٧/ وترا به‌ ئیمامى مالک رحمه الله
باشترین کار چییه‌ به‌نده‌ بیکات فه‌رمووى
طلب العلم.

(ترتیب المدارك ٦١)

٤٨/ ئیمامى شافعى رحمه الله ده‌ڵێ
وه‌سیه‌ت ده‌که‌م به‌ ته‌قواى الله تعالى وه‌ ده‌ستگرتن به‌ سوننه‌ت وه‌ ئاثاره‌کانى رسول الله ﷺ و هاوه‌ڵه‌کانى وه‌ وازهێنان له‌ بیدعه‌ و ئاره‌زووه‌کان وه‌ خۆ پاراستن لێى.

(إثبات صفة العلو (١٧٩))

٤٩/ ئیمامى احمد رحمه الله ده‌ڵێ
جوانى ئه‌خلاق ئه‌وه‌یه‌ ته‌حه‌مولى هه‌مووشتێک بکه‌ى له‌خه‌ڵــــک.

(جامع العلوم والحكم لابن رجب (182/1)

٥٠/ مالیك رحمه الله ده‌ڵێ
بۆ هیچ یه‌کێک حه‌ڵاڵ نیه‌ له‌ وولاتێک دانیشێت که‌ تێى دا جوێن به‌ سه‌له‌ف بدرێت.

(أحكام القرأن لابن العربي المالكي١ / ٦١١)

**٥١/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**هیچ شتێكم چاكتر نەبینیوە بۆ لادانی نەخۆشی لە وتنی سبحان الله.**

**(حلية الأولياء (٩/١٣٦))**

**٥٢/ المروذي دەڵێت پرسیارم لە ئیمام احمد كرد رحمه الله ئایا لەسەر پەردە قورئان دەنوسرێت؟**

**ئیمامی احمد زۆر پێی ناخۆش بوو فەرمووی قورئان لەسەر شتی هەڵواسراو نانوسرێت نە پەردە نە شتی تر.**

**(الورع:صـ١٥١)**

**٥٢/ ئیمامی احمد دەڵێ ئەوەی بانگی كردی بۆغەیری زەواج ئەوە بانگی كردوی بۆ غەیری ئیسلام.**

**(المغنى 7 /334)**

**٥٣/ ئیمامی مالك رحمه الله دەڵێ**

**هەركەسێك پێی خۆشە ئەوەی لە دڵی دایە الله تعالى بۆی ئاسان بكات و پێ ببەخشێت**

**باڵەكاتی نهێنی دا كاروكردەوەی باشتروچاكتر بێت زیاتر لەوكاتانەی كە بەتەنها نییە.**

**(ترتیب المدارك (٢/٦٠))**

**٥٤/ ئیمامی شافعی وەسیەتی قوتابیەکەی خۆی الربیع ی کوڕی سلیمان کرد پێی فەرموو**

**ئەگەر ویستت دڵت چاک بێ یان کوڕەکەت یان براکەت یان هەر کەسێک ویستت چاک بێت ئەوە بیسپێرە بە ژینگەیەکی قورئان وە لەنێوان هاوڕێیانی قورئان پەروەردگار چاکی دەکات بیەوێت یان نەیەوێت.**

**(حلية الأولياء لأبي نعيم (٩/١٢٣))**

**٥٥/ ئیمام ئەحمەد رحمەالله دەڵێ**

**با بەندە لە پەروەردگار بترسێت خواردن نەداتە خێزان و مناڵەکانی تەنیا حەڵاڵ نەبێت.**

**[ الحث على الصناعة والتجارة للخلال : ٨٠ ]**

**٥٦/ ئیمامی شافعی رحمە الله دەڵێ**

**هیچ شتێک نیە لەدوای نوێژەفەرزەکان بەندە نزیک بکاتەوە لە الله وەک لە فێربوونی زانستی شەرعی.**

**(طبقات الشافعيه البرى ٢ ١٢٩)**

**٥٧/ ئیمامی مالیک دەڵێ رحمە الله**

**تۆبەی لێ قبوڵناکرێ ئەوەی جنێو بە رسول الله صلى الله عليه وسلم دەدا جا موشریک بێ یان موسڵمان بێ.**

**(السير:٨/١١٤ـ١١٣)**

**٥٨/ ئیمامی شافعی دەڵێ رحمه الله**

**پێم خۆش نیه بۆ هیچ کەسێک وازبێنێ لە خۆشۆردنی ڕۆژی جومعه وه من وازی لێناهێنم قەت نە لە سەرمادا وە نە لە گەرمادا.**

**(كتاب الأم للإمام الشافعي (١/٢٣٩))**

**٥٩/ ئیمامی أحمد دەڵێ مــن داوای زانســت دەکەم تــا دەچمه نــاو گــۆڕ.**

**(شرف أصحاب الحديث ١٣٨)**

**٦٠/ ئیمامی مالك رحمەالله دەڵێ**

**به دایکمم ووت بچم بۆ نوسینەوەی زانست ووتی وەرە با جلی زانستت لەبەرکەم جلێکی کورت و گرجۆکۆڵی لەبەرکردم وە لەسەریشم کڵاوێکی دانا وە بە عەمامەیەک چواردەوری بەستەوە پاشان پێی فەرمووم ئێستا بڕۆ زانست بنوسەوە وە پاشان فەرمووی دایکم عیمامەکەی بۆ دەبەستام و پێی دەفەرموم بڕۆ لای ربیعه ئەدەبی فێربە پێش زانستەکەی.**

**(ترتيب المدارك: ١/١١٩)**

**٦١/ ئیمامی شافعی دەڵێ رحمه الله**

**هیچ خۆشیەك نیه بگاتەوە بەخۆشی هاوڕێیەتی برادەرەکان و هیچ خەم و خەفەتێکیش ناگات بە خەم و خەفەتی جیابونەوە لێیان.**

**(شعب الإيمان_٦_٥٠٤)**

**٦٢/ ئیمامی احمد رحمه الله ده‌ڵێ**

**سه‌لامه‌تی له (١٠) شتایه هه‌ر (١٠) یه‌كه‌ی بریتیه له‌له‌بیركردنی ئه‌وشتانه‌ی كه خه‌ڵك كردویانه به‌رامبه‌رت.**

**(البيهقي في كتابه شعب الإيمان (ج١٠/ص٥٧٥)**

**٦٣/ ئیمامی به‌ربه‌هاری ده‌ڵێ**

**ئه‌گه‌ر كه‌سێكت بینی (ابو هريره) و (أنس بن مالك) و (أسيد بن الحضير)ی خۆشده‌وێ بزانه ئه‌وه له‌سه‌ر سوننه‌ته إن شاء الله**

**ئه‌گه‌ر كه‌سێكت بینی (ايوب) و (ابن عون) و (يونس بن عبيد) و (عبدالله بن ادريس الأودی) و (الشعبی) و (مالك بن مغول) و (يزيد بن زريع) و (معاذ بن معاذ) و (وهب بن جرير) و (حماد بن زيد) و (حماد بن سلمه) و (ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س) و (الأوزاعی) و (زائده بن قدامه)یـ خۆشده‌وێ بزانه ئه‌وه له‌سه‌ر سوننه‌ته ،**

**ئه‌گه‌ر كه‌سێكت بینی (احمد بن حنبل) و (الحجاج بن المنهال) و (احمد بن نضر)یـ خۆش ده‌وێ و باسیان ده‌كات به چاكه و قسه‌كانی ئه‌وان ده‌گوت بزانه له‌سه‌ر سوننه‌ته.**

**(السنه البربهاری ١٤٤)**

**٦٤/ ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س ده‌ڵێ**

**زانست به زۆری ریوایه‌ت كردن نیه‌، به‌ڵكو نورێكه الله عزوجل ده‌یخاته نێو دڵه‌وه.**

**(المحدث الفاصل:ص٥٧٨)**

**٦٥/ پێشەوا حرملة دەڵێت**

**ئیمامی شافعی هیچ كەسێكی پێشی ئیمامی مالك نەئەخست لە فەرمووەدەدا.**

**(آداب الشافعي ومناقبه١٥٣)**

**٦٦/ أبو داود رحمه الله دەڵێ مەجلیسەكانی احمدی كوڕی حنبل رحمه الله مەجلیسی قیامەت بوون هیچ شتێكی لەكاروباری دنیا تیا باس نەئەكرا هەرگیز نەمبینیوە باسی دنیا بكات.**

**(سير أعلام النبلاء ١١/١٩٩)**

**٦٧/ وترا بە پێشەوا احمد**

**ئافرەت نابێت سەیری پیاو بكات وەك چۆن پیاو نابێت سەیری ئافرەت بكات ؟**

**فەرمووی بەڵێ.**

**(مسائل ابن هانيء ١٨٣٨)**

**٦٨/ ووترا بە ئیمام احمد كوڕی حنبل رحمه الله نێوان ئێمەو عەرشی الله تعالى چەندە ؟ فەرمووی نزایەكی ڕاستگۆیانەیە لە دڵێكی ڕاستگۆوە.**

**(مسائل ١/١٥٨)**

**٦٩/ ئیمامی مالیک دەڵێ بزانە خراپەكاریەكی زۆر گەورەیە كە ئینسان هەرچی بیستی قسەی پێ بكات.**

**(سير أعلام النبلاء (٨/٦٦))**

**٧٠/ ئیمامی شافعی رحمه الله ده‌ڵێ**

**هەرکەسێ زانستی خۆشنەوێت هیچ خێرێکی تێدا نییە**

**(تاريخ دمشق | ١٥/٤٠٧)**

**٧١/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**پێویستە لەسەر مرۆڤ کەسی بەوەفا و ڕاستگۆ بۆ هاوڕێیەتی خۆی هەڵبژێرێت وەک چۆن لەبۆ ماڵ و سامانی خۆی کەسێکی متمانە پێکراو هەڵدەبژێرێت.**

**(كتاب الإنتقاء٩٩)**

**٧٢/ ئیمام مالیك ده‌ڵێ**

**ئەگەر ناکۆکیەکتان تێکەوت لە آثرەکانی رسول الله ﷺ ئەوا سەیری کردەوەی دوو خەلیفەکەی دوای ئەو کەن ابو بکر و عمر ئەوە حەقە.**

**(ابن عبدالبر في الاستذكار(٣٠٤/٤))**

**٧٣/ ئیمامی احمد رحمه الله نەسیحەتی کوڕکەی ئەکات ده‌ڵێ**

**بەخێزانەکەت بڵێ خۆشم دەوێیت چونکە ئافرەتان ناز پێدانیان پێ خۆشە وە حەزیان بەوەیە خۆشەویستیان بۆ دەربڕیت بۆیە ڕەزیل مەبە لە دەربڕینی ئەو وشەیە بەخێزانەکەت ئەگەر ڕەزیلیت کرد لەنێوان ئەو خۆتدا پەردەیەك لە بێزاری و نوقسانی لە دەربڕینی خۆشەویستی دادەنێت.**

**( وصية الامام أحمد لابنه عند زفافه صحيح الترمذي : ( ٣٤٢١)**

**٧٤/ ئیمامی الحُمَیدي رحمه الله دەڵێ**

**دەمانەویست ڕەدی ئەهلی ڕەئی بدەینەوە وە نەمانزانی چۆن وەڵامیان بدەینەوە تاوەکو شافعی هات و ڕێگای نیشان داین.**

**(آداب الشافعي ومناقبه١٠٧)**

**٧٥/ ئیمامی مالیك وتی**

**ئەوەی پێچەوانەی سوننەتی رسول الله ﷺ بجولێتەوە ئەترسم تووشی فیتنە بوبێت چی لەو فیتنەیە گەورە ترە کە تۆ خۆت دەبینی پێش دەکەویت بۆ کارێکی چاکە کە رسول الله ﷺ نەچووە بیکات ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە**

**( فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ) (النور63)**

**دەبا ئاگادار بن ئەوکەسانەی کە پێچەوانەی فەرمانی ( رسول الله ﷺ) ڕەفتار دەکەن کە تووشی فیتنە ببن یان توشی سزایەکی سەخت.**

**(الجامع في العقائد ١٧٦)**

**٧٦/ کاتی گیرابوونی دوعا لە ڕۆژی جومعەدا**

**پێشەوا أحمد رحمه الله دەفەرمووێت زۆرینەی فەرموودەکان لەسەر ئەوەن کە لە دوای عەصرە.**

**(مسائل للكوسج)**

**٧٧/ ئیمامی شافعی رحمه الله ده‌ڵێ**

**به‌رزترین كه‌س له‌ناو خه‌ڵك ئه‌و كه‌سه‌یه كه له‌خۆ بایی نیه وه چاكترین كه‌س ئه‌و كه‌سه‌یه كه چاكی خۆی نابینێ.**

**(سير أعلام النبلاء ١٠/٩٩)**

**٧٨/ ئیمامی مالیك رحمه الله ده‌ڵێ**

**بزانه خراپه‌كاریه‌كی زۆر گه‌وره‌یه كه ئینسان هه‌رچی بیستی قسه‌ی پێ بكات.**

**(سير أعلام النبلاء (٨/٦٦))**

**٧٩/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**عیلم له‌به‌ركردن نیه عیلم سوود وه‌رگرتنه.**

**(حلية الاولياء ٩/١٢٣)**

**٨٠/ ئیمام احمد رحمه الله ووتی**

**ده‌رناچین له ئاثار و شوێنكه‌وتن جا شوێنكه‌وتن بۆ رسول الله ﷺ وه دوای ئه‌و بۆ هاوه‌ڵه‌كانیه‌تی ئه‌گه‌ر هاوه‌ڵان به‌وه ڕازیبن هاوه‌ڵان به‌جۆرێک بوون كه فه‌زڵی یه‌كتریان به‌سه‌ر یه‌كتر ده‌دا و هیچیان ئه‌وی تریان عه‌یبدار نه‌ده‌كرد جا له‌سه‌رمانه شوێنكه‌وتنی ئه‌وه‌ی پێشینمان له‌سه‌ری بوون وه ئیقتیدایان پێ ده‌كه‌ین.**

**(السنة لأبي بكر بن الخلال ٢/٤٠٢)**

**٨١/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ**

**خەڵکی سەیری الله تعالی ئەکەن لە ڕۆژی قیامەت بە چاوەکانیان.**

**(الآجري في الشريعة (٥٧٤))**

**٨٢/ البويطي دەڵێت بەئیمامی شافعی م وت**

**زۆر خۆت ماندوو دەکەی بەنووسینەوەی کتێب وە خەڵک سەیری کتێبەکانت و نووسینەکانت ناکەن.**

**فەرمووی ڕۆڵەکەم ئەمە حەقە وە حەقیش نافەوتێ.**

**(المقفى الكبير ٥/٢٠٧)**

**٨٣/ ـ ئیمام احمد دەڵێ**

**بە خۆراکی حەڵاڵ دڵ ئارام و نەرم ئەبێت.**

**(زاد المسافر : ٤/٧٧)**

**٨٤/ ایسحاق کوڕی عیسا دەڵێ گوێم لە مالیکی کوڕی ئەنەس بوو**

**مناقەشەی عەیبدار دەکرد لە دیندا وە دەی ووت هەرکاتێك پیاوێك بکەوێتە مووجادەلە و موناقەشە لەگەڵ پیاوێکی تردا ئیللا واز لەوە دێنیت کە جبریل بۆ موحەمەدی هێناوە ﷺ.**

**(الإبانة الصغرى ٨٥)**

٨٥/ پێشەوا **شافیعی** دەڵێ

له سوك كردن و ئیهانه كردنه به عیلم و زانست كه هەر كەسێك موناقەشەی لەگەڵ كردی موناقەشه بكەی وه دەمه دەمێ لەگەڵ هەموو كەس بكەی.

(مناقب الشافعي للبيهقي ٢ / ١٥١ )

٨٦/ ئیمامی **احمد** ووتویەتی

فیتنه ئەوەیه كه خەڵكی ئیمامێكیان نەبێ كاریان جێبەجێ بكات.

(السنة للخلال (١/٣٢)

٨٧/ **مالیکی** کوڕی ئەنەس دەڵێ

لەناو چوونی زانست ئەوەیه كه هەر كەسێك پرسیاری لێت كرد وەڵامی بدەیتەوه.

(العلل ومعرفة الرجال ص / ٢٦٤)

٨٨/ ئیمامی **شافعی** رحمه الله

حەدیثێکی له رسول الله ﷺ گێرایەوه پیاوێکیش پێی وت ئەی باوکی عبدالله تۆ کاری پێ ئەکەیت؟ دەڵێت بینیم شافعی توڕه بوو و هەڵساوه وه فەرمووی

چی زەوییێک من هەڵدەگرێت و چی ئاسمانێک من له ژێر خۆی دەشارێتەوه ئەگەر حەدیسێک له رسول الله ﷺ بگێرمەوه و کاری پێ نەکەم بەڵێ بەسەر گوێ و چاوم.

(صفة الصفوة ٤٣٨)

**٨٩/ ئیمامی احمد رحمه الله**

**چوو بۆ مزگەوت كەسانێک لەبەری هەڵسانەوە فەرمووی لەبەر هیچ كەسێک هەڵمەسنەوە چونكە مەكروهە.**

**(مسائل ابن هانيء ١٩٧٩)**

**٩٠/ ئیمامی احمد ووتی**

**هەر كەس ووتی الله دەستی هەیە وەكو دەستی من ئەوا الله ی چواندووە بە دروستكراوەكانی .**

**(الله تعالى دەستی هەیە بەڵام مەبەستی ئیمام احمد ئەوەیە نابێ بچوێنرێت بە دەستی هیچ كەس)**

**(كتاب الرَّدُ عَلَىٰ المُبْتَدِعَة لِإبنُ البَناءِ الحَنبَلي)**

**٩١/ ئیمامی مالك بە شافعی فەرموو كاتێك یەكەم جار شافعی بینی**

**من دەبینم پەروەدگار ڕووناكی خستۆتە ناو دڵت ئاگاداربە نەیكوژێنیەوە بە تاریكی تاوان.**

**(إعلام الموقعين (٢/٢٥٨))**

**٩٢/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێت**

**ئەو كەسەی دێتە مەجلیسی عیلم بێ قەڵەم و كاغەز وەكو ئەو كەسە وایە دێتە ئاش بێ گەنم.**

**(توالي التأسيس ص١٦٧)**

**٩٣/ ئیمامی أحمدی كوڕی حنبل دەڵێ**

**هیچ كەسێک نیە دەستی دابێتە پێنووس و قەڵەم ئیللا ئیمامی شافعی منەتی هەیە لە گەردەنی.**

(سير أعلام النبلاء (١٠/٤٧)

**٩٤/ ابن وهب دەڵێ ئیمامی مالیك پێی وتم**

**هەر بۆیە ئەمە دەبێتە بڵاوكردنەوەی فەساد لەسەر زەوی لەسەر دەسەڵاتدار ئەوەیە سزایی ئەو كەسانە بدا كەوا ڕێگر و چەتەن(لەرێگا بازرگانیەكان دینار و درهەم دەدزن یان غەیری ئەوەش، كە نمونەی ئەو بێ) لەسنوری دەسەڵاتیدا.**

(المحاربة من الموطأ لابن وهب:٨)

**٩٥/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەفەرموێت**

**هیچ زانستێک لەدوای لەزانستی حەڵاڵ و حەرام بەباشتر و ڕێز لێگیراوتر نازانم لە زانستی پزیشكی.**

(سير أعلام النبلاء ١٠/٥٧)

**٩٦/ پرسیار لە ئیمام ئەحمەد كرا**

**دەربارەی پیاوێک بەلای كۆمەڵێک خەڵک تێپەر دەكات سەلام دەكات و وەڵامی نادەنەوە ؟**

**ئیمام وتی با هەنگاوەكانی خێرا بكات بۆ ئەوەی نەفرەت پێی نەگات لەگەڵ ئەو كەسانە.**

(الآداب الشرعية | لابن مفلح (١/ ٣٩٧)

**٩٧/ ئیمامی مالك رحمه الله دەڵێ**

**ئاثار کەم نابێتەوە لەناو هیچ کۆمەڵێکدا ئیللا هەواو ئارەزوو لەناویاندا بڵاو دەبێتەوە وە زانایان کەم نابنەوە لەناو خەڵکیدا ئیللا خەڵکی دوور دەکەونەوە لەدین.**

**(ذم الكلام : ٨٨٢)**

**٩٨/ ئیمام مالیک دەڵێ بە پیاوێك ووترا کە لە سەرەمەرگ دا بوو لەسەر چ دینێکی ؟**

**ووتی لەسەر دینی أبی عمارة أبی عمارة یەکێک بوو لە ئەهلی ئەهواء**

**ئیمام مالیک ووتی واز لە دینی أبی قاسم ﷺ دێنیت وە دەمریت لەسەر دینی أبی عمارة؟!.**

**(الإبانة الصغرى ١٤٠)**

**٩٩/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**هەر کەسێ زانستی خۆش نەوێت خێری پێوە نیە با لە نێوان تۆ ئەودا ناسیاری و هاوڕێیەتی نەبێت.**

**(البيهقي في المناقب ٢ / ١٤٤)**

**١٠٠/ ئیمامی احمد رحمه الله دەڵێ هەرکەسێک بمرێ لەسەر ئیسلام و سوننەت، ئەوا مردووە لەسەر هەموو خێرێک.**

**[ سير أعلام النبلاء ١١ - ٢٩٦ ]**

**١٠١/ إبن وهب ده‌ڵێ پرسیارم له‌ ئیمام مالیك كرد رحمه‌ الله**

**سه‌باره‌ت به‌ قه‌ده‌ریه‌كان ئایه‌ باشتر وانییه‌ واز له‌ قسه‌ كردن و به‌ربه‌ره‌كانێ كردن بهێنین له‌گه‌ڵیان؟**

**ئیمامی مالیك ووتی به‌ڵێ ئه‌گه‌ر زانیت ئه‌و كه‌سه‌ له‌سه‌ر چیه‌**

**ووتیشی وه‌ فه‌رمان ده‌كه‌ن به‌ چاكه‌ وه‌ ڕێگری ده‌كه‌ن لێیان به‌ خراپه‌ وه‌ پێیان ده‌ڵێین ئه‌و خیلافه‌ی له‌ نێوانمان هه‌یه‌ وه‌ خۆت به‌گه‌وره‌ مه‌زانه‌ له‌ ووتنی وه‌ نوێژ له‌ دوایانه‌وه‌ ناكه‌ین واشی نابینم زه‌واج له‌گه‌ڵیان بكرێت.**

**(الإبانة الصغرى ١٥٦)**

**١٠٢/ ئیمامی شافعی رحمه‌ الله ده‌ڵێ**

**بۆماوه‌ی ١٦ ساڵ تێرم نه‌خواردوه‌ ته‌نها جارێك نه‌بێت.**

**(السير التذهيب١٨٤١)**

**١٠٣/ عبدالله ی كوڕی امام احمد ده‌ڵێ**

**باوكم له‌ هه‌موو شه‌و و ڕۆژێكدا سێ سه‌ت ڕكاعه‌ت نوێژی ده‌كرد به‌ڵام كاتێك نه‌خۆش كه‌وت و لاواز بوو به‌هۆی ئه‌و قامچیانه‌ی كه‌ لێیاندا بوو ئینجا له‌ هه‌موو شه‌و و ڕۆژێكدا سه‌ت و په‌نجا ڕكاعه‌ت نوێژی ده‌كرد.**

**(پێشه‌كی كتاب الزهد لا ١٢)**

١٠٤/ ئیمامی احمد کوڕی حنبل دەڵێ
هەمووشتێک له ئافرەت دا عەورەته هەتا نینۆکەکانیشی

(احكام النساء الامام احمد رواية اخلال صـ٣٣-٣٢)

١٠٥/ ئەو پیاوەی کاتێك دەهات کە ئەهلی ئەهوائ بوو دەهات بۆ لای ئیمام مالیک

ئیمام فەرمووی من الله تعالی بەرچاو ڕوونی پێبەخشیوم لەسەر دینەکەی خۆم بەڵام ئێوە گومانتان له دینەکەی خۆتان هەیە بڕۆن بۆ لای یەکێك کە وەك خۆتان گومانی له دینەکەی هەبێ لەگەڵ ئەودا موناقەشە و بەربەرەکانێ بکەن.

(الإبانة الصغرى ١٥٨)

١٠٦/ ئیمامی شافعی دەڵێ
طلب العلم چاکترە له نوێژی سووننەت.

(شرح مذاهب أهل السنة٦٣)

١٠٧/ پرسیار کرا له ئیمام احمد دەربارەی عەزابی قەبرو نکیرو مونکەر

ئیمامی احمد فەرمووی عەزابی قەبرو نکیرو مونکەر حەقن و بڕوامان بە هەمووی هەیە, هەرکەسیش ئینکاری شتێ لەمانە بکات جەهمییە و کافرە.

(مسائل إبن هانئ" ١٨٧٩)

**١٠٨/ ئیمام مالیک ده‌یگێڕێته‌وه ده‌ڵێ**

**پیاوێک وتی من هاتوومه‌ته ناو ئه‌و هه‌موو دینانه‌وه له هیچ كامێكیان جێگیربوون و استقامه‌م نه‌بینیوه**

**پیاوێك له خه‌ڵكی مه‌دینه له‌وانه‌ی كه قسه‌كردنی باش بوو ووتی**

**من پێت ده‌ڵێم بۆچی وایت  له‌به‌ر ئه‌وه‌ی تۆ ته‌قوای الله تعالی ـت نیه له الله تعالی ناترسی ئه‌گه‌ر هاتوو له الله تعالی بترسابای الله تعالی خۆی ڕێگایه‌كی نیشان ده‌دایت.**

**(الإبانة الصغری ١٥٩)**

**١٠٩/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**ئه‌گه‌ر عوزر بۆ نه‌زان بهێنرێته‌وه له‌به‌ر نه‌زانیه‌كه‌ی ئه‌وا نه‌زانین زۆر خێرتر و باشتر بوو له علم**

**وه ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**حوجه و بیانو نیه بۆ به‌نده به‌هۆی جه‌هل و نه‌زانیه‌كه‌یه‌وه له‌دوای ئه‌وه‌ی كه ده‌نگ و بانگه‌وازی ئیسلام و قورئانی پێگه‌یشتووه وه ده‌توانێت فێر بێت.**

**(المنثور للزركشي ٢/١٧)**

**١١٠/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئەگەر پیاو بوو بە صۆفی لەسەرەتای ڕۆژەوە**

**ئەوا نیوەڕۆی بەسەردانایەت دەبێت بەکابرایەکی گێل احمق.**

**(مناقب الشافعي ٢/٢٨٣ للبيهقي)**

**١١١/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**کۆکراوەی هەموو چاکەیەک دوورکەوتنەوەیە لە خراپە.**

**(كتاب الأم للشافعي ٥/٨٩)**

**١١٢/ أبو سهيل مامی ئیمام مالیک دەڵێ**

**عومەری کوڕی عبدالعزيز گفتوگۆی لەگەڵ کردم سەبارەت بە قەدەریەکان**

**ووتم وایدەبینم ئیستیتابە بکرێن یان تەوبە دەکەن یان دەکوژرێن**

**عومەر وتی ئەمە بۆ چونی منیشە**

**مالیکی کوڕی ئەنەس و الحسن یش هەمان بۆ چونیان هەبووە.**

**(الإبانة الصغرى ١٦٠)**

١١٣/ پرسیار كرا له ئیمامی احمد رحمه الله و منیش گوێم لێ بوو ( أبي القاسم البغوي ) ده‌رباره‌ی پیاوێک وون بووه ؟

ئیمام احمد فه‌رمووی ماڵه‌كه‌ی دابه‌شه‌كرێت دوای چوار ساڵ.

(مسائل الإم أحمد بن حنبل ، ريواية أبي القاسم البغوي)

١١٤/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێت

خوێندنه‌وه‌ی فه‌رمووده پاداشتی زیاتره له نوێژی سوننه‌ت.

(ذم الكلام للهروي ٦/٦٠)

١١٥/ ئیمام ماليك ده‌ڵێ

ئه‌گه‌ر بێتو ده‌سه‌ڵاتم بێت به‌سه‌ر ئه‌وه‌ی ته‌فسیری قورئان ده‌كات ئه‌مدا له‌سه‌ری.

(الحليه ٢ ٣٥٥)

(مه‌به‌ستی ئه‌وانه‌یه كه ته‌فسیری قورئان ده‌كه‌ن به ڕاو ئه‌قڵ به بێ ئه‌و ته‌فسیره‌ی له سه‌له‌فه‌وه هاتوه).

١١٦/ ئیمامی أحمد ده‌ڵێ

ئافره‌تێک نوێژ نه‌كات طلاقی بده چوونكه هیچ خێریكی تێیدا نیه بۆت.

(المغني لابن قدامة ٣ / ٤٤٥)

**١١٧/ ئیمامی شافعی دەڵێت**

**ئەگەر سوننەتێکتان لە رسول اللهوە ﷺ دۆزیەوە شوێنی بکەون وە ئاوڕ مەدەوە لە قسەی هیچ کەسێک.**

**(حلية الأولياء ٩/١٠٧)**

**١١٨/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**سەلەف فێری منداڵەکانیان دەکرد خۆشەویستی ابو بکر و عمر رضی الله عنه وەک چۆن فێری سورەتی قورئانیان دەکردن.**

**(شرح اصول السنة اللالكائـي)**

**١١٩/ ئیمام حنبل دەڵێ**

**چوم بۆ حەج لەوێ پەردەی کەعبەم دی ئەمەی لێ نوسرابوو ( ليس كمثله شيء وهو اللطيف الخبير ) ئایەتەکە خۆی بەم جۆرەیە { ليس كمثله شيء وهو السميع البصير } کاتێک گەڕامەوە بەغداد گێرامەوە بۆ ئیمامی احمد رحمه الله فەرمووی الله بیکوژێ ئەو پیسە دەستی چوەتە گۆڕینی کتابی الله ش مەبەستی [ ابن ابی دؤاد ] بوو کە ئیمامی معتەزیلەکان بوو دەستێکی باڵای هەبوو لە فیتنەی خەلقی قورئان .**

**(طبقات الحنابلة ( ١/٣٦٨ )**

**١٢٠/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێت**

**نوێژی وتر ئەوەی وازی لێ بێنێت حاڵی خراپ ترە لەو کەسەی واز لە سوننەتەکانی شەو و ڕۆژ دێنێت.**

**(كتاب الأم للإمام الشافعي ١/٨٧)**

**١٢١/ عبدالرزاق ووتی معمر وە ابن جريج وە الثوری وە مالیکی کوڕی ئەنەس وە ابن عينە دەڵێن**

**ئیمان وتە و کردەوەیە زیاد دەکات و کەم دەکات.**

**(السنه عبدالله ٧٠٤)**

**١٢٢/ بە ئیمامی احمد یان وت رحمه الله کەسێك بە ڕۆژو بێت و نوێژ بکات وە بمینێتەوە لەمزگەوت بۆ اعتکاف کردن خۆشەویسترە لەلای تۆ یان قسەکردن لەسەر ئەهلی بیدع ؟**

**فەرمووی ئەگەر نوێژی کرد اعتکافی کرد ئەوە بۆ نەفسی خۆیەتی**

**وە ئەگەر قسەی لەسەر ئەهلی بیدع کرد ئەوە بۆ هەموو موسلمانانە ئەوەیان باشترە.**

**(مجموعة الرسائل والمسائل لشيخ الإسلام ٤/١١٠)**

**١٢٣/ پرسیار کرا لە ئیمامی شافعی گومانی خراپ بە پەروەردگار چۆنە ؟**

**فەرمووی**

**بە وەسواسی وە ترسی هەمیشەیی لە ڕوودانی موسیبەت وە چاوەڕوانی نەمانی نیعمەت ئەم شتانە هەمووی لە گومانی خراپە بەزاتێکی بەخشندەی میهرەبان.**

**(حلية الأولياء ٩/١٢٣)**

**١٢٤/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**ئه‌گه‌ر له حدیث هیچ شتێك نه‌بوایه ئیللا ڕه‌ئی نه‌بێت ئه‌وا ڕه‌ئی ئیمام مالیكم هه‌ڵده‌بژارد.**

**(لمقدمه‌ی كتابی الجرح والتعدیلی ابن ابي حاتم)**

**١٢٥/ ئیمامی احمد بۆی گێڕانه‌وه وتی**

**أبو سلمه الخزاعی بۆی گێڕاینه‌وه وتی مالك وه شیرك وه أبو بكر بن عیاش وه عبدالعزیز بن أبی سلمه وه حماد بن سلمه وه حماد بن زید ده‌ڵێن**

**ئیمان ناسینه له دڵه‌وه وه دانپێدانانه به زمان وه كرده‌وه پێ كردنه به جه‌سته.**

**(السنه عبدالله بن أحمد ٥٩٩)**

**١٢٦/ ئیمامی شافعی ده‌فه‌رمووێت**

**داواكردنی شتانێكی زیاد له پێویست له دونیا سزایه‌كه په‌روه‌ردگار ئه‌هلی ته‌وحیدی پێ سزا داوه.**

**(كتاب مناقب الشافعي (٢/١٦٩)**

**١٢٧/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**بنچینه‌كانی السنة ئه‌قیده( ئه‌وه‌یه كه ده‌ست بگرین به‌وه‌ی كه هاوه‌ڵانی رسول الله صلى الله عليه وسلم له‌سه‌ری بوون.**

**{اللالكائي}**

**١٢٨/ پیاوێک هات بۆ لای ئیمامی شافعی رحمه الله ووتی**

**پرسیار بکەم؟ شافعی ووتی بپرسە کابرا ووتی لە دینی الله چ شتێک بەڵگەیە؟ شافعی ووتی کتێبی الله کابرا ووتی چیتر؟ شافعی ووتی سوننەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کابرا ووتی چیتر؟**

**شافعی ووتی ڕێککەوتنی ئومەت کابرا ووتی لە کوێی قورئان هێناوتە کە ئەڵێیت ڕێککەوتنی ئومەتیش هەیە؟**

**شافعی بیریکردەوە ماوەیەک کابرا ووتی سێ ٣ ڕۆژان لێتئەگەڕێم بزانم چیئەڵێیت شافعی ڕەنگی تێکچوو دواتر ڕۆیشت ٣ ڕۆژ لە ماڵ نەهاتە دەرەوە دواتر هاتەدەرەوە کابراش هاتەوە و ووتی وەڵامی پرسیارەکەم؟ شافعی ووتی**

**بەڵێ الله فەرموویەتی(ئەوەی لە پێغەمبەر جیا ببێتەوە لەپاش ئەوەی کە ڕێگای هیدایەتی بۆ ڕوونبویەوە وە شوێن ڕێبازێک بکەوێت کە جیا بێت لە ڕێبازی تێکڕای موسڵمانان ئێمە ڕووی وەرئەگێرین بۆ ئەو ڕووگەی ڕووی تێکردووە وە دەیخەینە دۆزەخ و سەرئەنجامی خراپ)**

**دەی کەسێک لەسەر جیاوازی ڕێبازی موسڵمانان ناخرێتە دۆزەخ گەر فەرز نەبایە کابرا ووتی ڕاستە**

**دواتر هەڵسا و ڕۆیشت شافعی ووتی سێ ٣ جار قورئانم خوێندەوە شەو و ڕۆژ تا دۆزیمەوە.**

**(المدخل إلى السنن الكبرى للبيهقي)**

١٢٩/ ابن مسلم ووتی گوێم له ئه‌وزاعی وه مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س وه سعیدی كوڕی عبدالعزیز بوو

ئینكاری ئه‌وه‌یان ده‌كرد بڵێی من ئیماندارم وه ڕێگه‌یان ده‌دا به إستثناء كه بڵێی من ئیماندارم إن شاء الله.

(السنه عبدالله ٧٢١)

١٣٠/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ

ئاره‌زووی شتێك ده‌كه‌م كه‌ناكرێت ناگونجێت ئاره‌زووی شوێنێك ده‌كه‌م كه‌هیچ كه‌سی تیانه‌بێت.

(سير اعلام النبلاء ١١ | ٢)

١٣١/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێت

پێم خۆشه هه‌موو كه‌سێك له شه‌ودا به‌پێی توانا بخوێنێته‌وه له قورئان.

(كتاب الأم للشافعي (١/٧٣)

١٣٢/ ابن وهب ده‌ڵێ بیستم له ئیمامی مالك فه‌رمووی

زه‌لیلی و ئیهانه كرد به زانست، ئه‌وه‌یه كاتێ پیاو قسه‌ی كرد به علم له‌گه‌ڵ یه‌كێكی بكا كه ده‌زانێ گوێرایه‌ڵی ناكا.

(ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥١)

١٣٣/ وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣)

ئیمامی شافعی فه‌رموویه‌تی

ئه‌گه‌ر الله ته‌نها ئه‌م سوره‌ته‌ی بۆ مرۆڤایه‌تی بناردایه كه بكرێته به‌ڵگه ئه‌وه‌نده‌یان به‌س بوو.

(الاصول الثلاثة)

١٣٤/ یحیی كوڕی معین ده‌ڵێ

هیچ كه‌سێكم وه‌ک ئیمامی أحمد كوڕی حه‌نبه‌ل نه‌بینیوه په‌نجا ساڵ پێكه‌وه‌بوین هیچ كاتێك شانازی به‌سه‌ر ئێمه‌وه نه‌ده‌كرد له‌وه‌ی كه تێی دا بوو له چاكه‌و خێر.

(الحلية الأولياء)

١٣٥/ ئیمامی مالیك رحمه‌الله ده‌ڵێ به‌شێک(له زانایان) ده‌فه‌رموون زانست فێرنه‌بووم ته‌نها بۆ خۆم نه‌بێ(كه سوودی لێببینم) وه فێری نه‌بووم ته‌نها ئه‌وه نه‌بێ خۆم موحتاجیم

ئیامی مالیك ده‌ڵێ وه به‌هه‌مان شێوه به‌شێک له خه‌ڵكی ده‌فه‌رموون زۆر له یه‌كدیان نه‌ده‌كرد له هه‌ندێ شت وه پرسیاریان له‌سه‌ركردبا

ئیمامی مالیك ده‌ڵێ زانست حیكمه‌ته وه نورێكه الله عزوجل هیدایه‌تی كێی بووێ پێیده‌دا وه زانست به زۆری مه‌سئه‌له نیه.

(ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٤٩)

**١٣٦/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئەگەر كەسێكتان بینی لەسەر ئاو دەڕۆیشت وە لە هەوا دەفڕێت ئەوە پێی هەڵمەخەڵەتێن تاكو كردەوەكانی دەپێون بە تەرازووی قوڕئان و سوننەت.**

**(طبقات الشافعية (٦٣))**

**١٣٧/ صالحی كوڕی ئیمامی احمد دەڵێ**

**بە باوكمم ووت**

**پیاوێكی چاك (هەبێت) بەڵام فەرمووده وەرنەگرێت كاری پێناكات ئیمامی احمد ووتی بەوە ناوترێت چاك هیچ ڕێزی نیە.**

**( جامع المسائل ٧ / ٣٢٥ )**

**١٣٨/ ابن وهب دەڵێ بیستم لە ئیمامی مالیك فەرمووی بێگومان ئەوكەسەی داوای علم دەكا دەبێ نەرموونیان و ئارامگر و بە خەشیە بێ وە دەبێ شوێنكەوتەی آثاری پێش خۆی بێ(لە سەلەف).**

**(ما رواه الأكابر عن مالك بن انس: ٥٢)**

**١٣٩/ پێشەوا بحر ی كوڕی نصر دەڵێت**

**نەبینیومە و نەبیستوومە لە سەردەمی شافعی هەبووبێ لە خواترس تر لە شافعی وە دەنگ خۆش تر لەو لەقوڕئان خوێندنەوە.**

**(كتاب مناقب الشافعي (٢/١٥٨)**

**١٤٠/ عبداللەی کوڕی پێشەوا احمد کوڕی حەنبەل دەڵێ**

**باوکم بەردەوام قەڵەمی لەدەست بوو تاوەکوو وەفاتی کرد.**

**(الكفاية للخطيب البغدادي ٥٧٤)**

**١٤١/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**مەهێڵە کەسی دڵ نەخۆش و گومڕا قسەت بۆ بکات و گوێ بیستی بیت نازانی کام ووتەی بە دڵتەوە دەنوسێ**

**کەسێک لە ئەنصار کە خەڵکی مەدینە بوو گوێ بیستی شتێک بوو لە کەسێک ئەهلی قەدەر قسەکە بە دڵیەوە نوسا دەچوو بۆلای براکانی کە هاوڕێیەتی کردوون ئەوانیش نەهیان لێی کرد**

**ئەویش ووتی ئەی چی لەوە بکەم کە بە دڵمەوە نوساوە ؟ گەر بزانم الله ڕازییە بەوەی خۆم هەڵدەمە خوارەوە لەسەر ئەم منارەیە ئەوا دەمکرد.**

**(الجامع لابن أبي زيد القيرواني١٢٠)**

**١٤٢/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**بنچینەی عیلم قورئانە یان سوننەتە ئەگەر نەدۆزیەوە کار بەقیاس بکە لەسەر قورئان و سوننەت.**

**(آداب الشافعي ومناقبه (٢٧٦))**

**١٤٣/ پرسیار كرا له‌ئیمامی احمد**

**چی ده‌ڵێیت له‌سه‌ر إستثناء له‌ ئیماندا ووتی ئێمه‌به‌ره‌و ئه‌وه‌ ده‌ڕۆین**

**وترا كه‌كه‌سێک ده‌ڵێت من ئیماندارم إنشاء الله**

**ووتی به‌ڵێ**

**(السنه حرب الكرمانی ١٤٧)**

**(ده‌ڵێم له‌ عه‌قیده‌ی ئه‌هلی سوننه‌ ئیمان ووته‌ و كرده‌وه‌و نیه‌تی دڵه‌ وه‌ استثناء یـ تیا ده‌كرێت ده‌بێ بڵێی ئیماندارم إن شاء الله)**

**١٤٤/ ئیمامی مالیك رحمه الله زۆر ئه‌یووت ما شاء الله زۆر دووباره‌ی ئه‌كرده‌وه‌**

**بۆیه‌ پیاوێک گله‌یی له‌ ئیمامی مالیک كرد له‌به‌ر زۆری دووباره‌كردنه‌وه‌ی ما شاء الله پیاوه‌كه‌ له‌ خه‌ویدا پێی وترا تۆ گله‌یت له‌ ئیمامی مالیک كردووه‌ له‌به‌ر زۆری ما شاء الله كردن ئه‌گه‌ر مالیک بیه‌وێ خه‌رده‌ل كون بكات به‌ ما شاء الله كردن ئه‌وا كونی ئه‌كرد.**

**(اللالكائی ١٦٢٤)**

**١٤٥/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**له‌ پیاوه‌تی نیه‌ مرۆڤ باسی ته‌مه‌نی خۆی بكات چونكه‌ ئه‌گه‌ر بچووک بێت به‌ كه‌سێكی كه‌م سه‌یری ده‌كه‌ن وه‌ ئه‌گه‌ر گه‌وره‌ش بێت به‌ كه‌سێكی به‌ساڵاچوو سه‌یری ده‌كه‌ن.**

**(الصلة في تاريخ أئمة (٣٢٦))**

١٤٦/ پرسیار كرا له ئیمامی احمد رحمه الله
نێوانی ئێمه و عه‌رشی الله تعالى چه‌نێكه‌؟
ئیمامی احمد فه‌رمووی دوعایه‌كی ڕاسته‌قینه له دڵێكی ڕاستگۆ.

(طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى ت الفقي ج1/ص50)

١٤٧/ ابن لهيعة ده‌فه‌رمووێ
حه‌جیان كرد اعمش له كوفه ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س له مه‌دینه وه عثمان البتي له به‌صرا دانیشت له مزگه‌وتی حه‌ڕام فه‌توایان ده‌دا وه هه‌ندێ موخالەفه‌ی یه‌كتری بوون پیاوێک به اعمش ووت ئه‌وه موخالەفه‌ی ئه‌هلی مه‌دینه ده‌كه‌ن؟

ئیمامی اعمش فه‌رمووی پێشتر اختیلاف مان نه‌بوو وه ئێستا رازین به زاناكانمان وه ئێمه‌ش به زاناكانیان.

(ما رواه مالك عن الأكابر: ٣١)

(چه‌نده به جوانی مامڵه‌یان ده‌كرد كاتێك له بابه‌تێك خیلافیشیان هه‌با)

١٤٨/ ئیمامی شافعی ده‌فه‌رمووێت
نازانێت ڕیا چیه ته‌نها ئه‌و كه‌سانه‌ی كه موخلیسن.

(شعب الإيمان (٩/١٨٨))

١٤٩/ ئیمامی احمد دەڵێ

هەموو شت بەقەدەرە تەنانەت دزی و زینا و ئارەق خواردن و هەموو خێر و شەڕێک

(کتاب السنه للخلال).

١٥٠/ ابن مهدي هێناویەتی کە پیاوێک پێی ووتووە پێم گەشتووە تۆ وتووتە مالـك فەقیهـ ترە لە ابو حەنیفە

ابن مهدي ووتی من ئەوەم نەوتووە

بەڵکو وتوومە زاناترە لە مامۆستای ابوحەنیفە مەبەستی حمادە.

ـعبدالسلام بن عاصم ووتی بە أحمد بن الحنبل م ووت

پیاوێک دەیەوێ حەدیث لەبەرکات حەدیثی کێ لەبەرکات

ئیمامی احمد پێی ووتم حەدیثی ئیمام مالك بن انس

پێم ووت پیاوێک دەیەوێ سەیری رەئی کات سەیری رەئی کێ بکات

ئیمامی احمد فەرمووی ڕەئی ئیمام مالك بن أنس.

هارون دەڵێ بیستم لە شافعی فەرمووی

زانست یعنی حەدیس لای سێ کەسە مالك بن أنس سفیان بن عیینة اللیث بن سعد.

(مناقب الإمام مالك: ص٢١)

١٥١/ ئیمامی أحمد کە دوعای دەکرد دەیفەرموو

اللهم لا تمنعنا خير ما عندك بِشر ما عندنا

واتە ئەی خودایە لەو خێرەی لاتە بێبەشمان مەکە

بەهۆی ئەو شەڕەی هەمانە.

(طبقات الحنابلة_٢٠٥_١)

١٥٢/ ئیمامی شافعی دەڵێ

خەڵکانێک قسەیان لە عیلم کردوە ئەگەر قسەیان نەکردایە لە هەندێک شت بێدەنگ بوونایە باشتر بوو بۆیان وە سەلامەتتر بوو.

(كتاب مناقب الشافعي (١/٣٣))

١٥٣/ ئیمام شافعی دەڵێ

ئەگەر ئافرەت پێش نوێژی بۆ پیاو و ژن و منالی کوڕی کرد ئەوا نوێژی ئافرەت دروستە بەلام نوێژی منالی کوڕ و پیاو دروست نییە چونکە خوای گەورە پیاوی کردووە بەڕێوەبەری ئافرەت و وە نابێت ئافرەت بەڕێوەبەری پیاو بێت بە هیچ شێوەک دروست نییە ئافرەت ئیمام پیاو بێت لە نوێژ دا

( الأم ج١ لاپەڕە ١٩١)

**١٥٤/ پرسیار کرا لە ئیمامی مالک رحمه الله**

**ئەگەر پیاوێک منالٚ بێنێت بۆ مزگەوت ئایا سوننەتە ؟**

**لەوەلامدا فەرمووی ئەگەر ڕەوشتی مزگەوت فێرکرابێت و پشێوی نەنێنێتەوە لە ناومزگەوت وانابینم هێنانی کێشەی تێدابێت.**

**(البَيان والتّحصيل (١ /٢٨٤))**

**١٥٥/ ئیمام احمد رحمه الله دەڵێ**

**دایکی صالٚح ٢٠ ساڵ لەگەڵم ژیا من و ئەو لەیەک وشەدا ناکۆک نەبوین.**

**(طبقات الحنابلة ٢/٥٨٣)**

**١٥٦/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**لە ڕۆژی قیامەت کاتێک پەردەی کردەوەکانی مرۆڤەکان لادەچێ و ئاشکرا دەبێ هیچ کردارێک نابینن بەقەد زیکر و یادی الله تعالی پاداشتی هەبێ ئەو کاتە خەڵکانێک پەشیمان دەبنەوە دەڵێن هیچ شتێک ئاسانتر نەبوو لەسەرمان لە زیکر.**

**(الوابل الصيّب من الكلام الطيب (١١١))**

**١٥٧/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ**

**زۆر دەرمەچن لە ماڵ مەگەر بۆ کارێک زۆر زەروربێت**

**هەروەها دامەنیشن لە مەجلیسێک عیلمێکی لێ فێرنەبی.**

**(ترتيب المدارك (٢/٦٣))**

**١٥٨/ ئیمامى احمد رحمە الله دەڵێ**

**ڕازی کردنی خەڵکیم وازلێهێنا تاوەکو توانیم حەق بڵێم.**

(سير أعلام النبلاء : (١١/٣٤))

**١٥٩/ ئیمام شافعي رحمە الله دەڵێ**

**هەر کەسێک بڵێ  لەفزم بە قورئان یان قورئان بە لەفزم مەخلوقە ئەوا جەهمیە.**

(شرح اصول اعتقاد للالكائي٥٦٦)

**١٦٠/ ئیمامى مالیك رحمە الله دەڵێ**

**من مرۆڤێکم هەڵە دەکەم و ڕاستیش دەکەم  جا سەیری بۆچوونم بکەن هەرچی لەگەڵ  قورئان و سوننەت بوو دەستی پێوە بگرن وە هەرچی لەگەڵ  قورئان و سوننەت نەبوو وازی لێبهێنن**

(جامع بيان العلم وفضله لابن عبد البر، 32/2).

**١٦١/ أبو داود السجستاني وتی**

**گوێم لە باوکی عبدالله (ئیمام احمد) بوو باسی کتێبی الحیل ی ( ابو حنیفەی) کرد لە هاوەڵانی ڕەئی ـەوە وتی فێڵ ئەکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی سوننەتی رسول الله ﷺ**

**صالح ووتی باوکم وتی الحیل ـمان بەلاوە جائیز نییە.**

(إبطال الحيل لـ إبن بطة العكبري : ٦٥)

١٦٢/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ

ئاماده بوونی جومعه فه‌ڕزه له‌سه‌ر هه‌موو موسڵمانێكی وه چوون بۆی فه‌ڕزه والله سبحانه وتعالی أعلم.

(حلية الأولياء (٩/١٣٧))

١٦٣/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ

هیچ كه‌سێكی نیه فێرخوازی عیلم بكات به‌قووڵ بوونه‌وه و له‌خۆبایی بوون و سه‌ركه‌وتوبێ (سه‌ركه‌وتو نابێت)

به‌ڵام ئه‌وه‌ی فێرخوازی بكات به ده‌ست كورتی و زه‌لیل كردنی نه‌فسی خۆی و خزمه‌ت كردنی زانایان سه‌رده‌كه‌وێت.

(حلية الأولياء (٩/١١٩))

١٦٤/ ئیمامی مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س ده‌ڵێ

هیچ كه‌سیک نیه له پاش رسول الله ﷺ ئیلا وته‌ی وه‌رده‌گیرێ و وته‌یشی ڕه‌د ده‌كرێته‌وه جگه له رسول الله ﷺ.

(جامع بيان العلم، 91/2)

١٦٥/ ئیمامی احمدی كوڕی حه‌نبه‌ل ده‌ڵێ

ته‌نها ئه‌وه‌مان له‌سه‌ره كه شوێن ئه‌وانه‌ی پێش خۆمان بكه‌وین.

(مسائل الكوسج ١٩٦٣)

**١٦٦/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**هیچ ڕه‌دێكی به‌هێزترم نابینیوه له‌سه‌ر موڕجیئه له قه‌وڵی الله تعالى كه ده‌فه‌رموویێت**

**﴿وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ﴾ (البينة ٥)**

**(حلية الأولياء (٩/١١٥))**

**١٦٧/ الهیثم بن جمیل ده‌ڵێ**

**لای ئیمامی مالیك بووم(ئاماده‌ی مه‌جالیسه‌كه‌یان بووم) چل و هه‌شت پرسیاری له مه‌سائیله‌كان لێی كرا سی و دووی تێیدا ووتی نازانم.**

**المثنی بن سعد القصیر ده‌ڵێ بیستم له مالك ووتی هیچ شه‌وێک نه‌بووه ئیلا رسول الله م ﷺ له‌خه‌و بینیوه.**

**(المناقب الإمام مالك: ص٣٣)**

**١٦٨/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**دانایه‌ک بۆ دانایه‌كی نووسی براكه‌م په‌روه‌ردگار عیلمی پێ به‌خشیوی جا عیلمه‌كه‌ت به تاریكی تاوانه‌كان پیس مه‌كه له ڕۆژێک كه ئه‌هلی عیلم به‌ڕووناكی عیلمه‌كه‌یان ئه‌چنه به‌هه‌شته‌وه.**

**(حلية الأولياء (٩/١٤٦))**

**١٦٩/ ئیمامی احمد رحمه الله دەڵێ**

**جێ بەجێ کردنی یەك حوکمی الله باشترە لە ٤٠ رۆژ باران بارین.**

**(السنه الخلال ١٧)**

**١٧٠/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ**

**لەم شارە واتە مەدینە گەیشتم بە کۆمەڵانێک کە هیچ عەیبێکیان نەبوو کەچی عەیبیان لەخەڵکی دەگرت جا بەهۆیەوە خۆشیان توشی عەیب داری بوون**

**وە گەیشتم بە کۆمەڵانێک کە خۆیان عەیب داربوون و عەیبیان هەبوو بەڵام بێدەنگ بوون لە عەیب و کەم و کورتی خەڵکی بۆیە بەهۆیەوە عەیب و کەم کورتیەکانیان لەیاد کرا.**

**(الضوع اللامع ١٠٦/١)**

**١٧١/ ئیمامی شافعي رحمه الله دەڵێ**

**بەو کەسە دەووترێ کە نوێژی تەرک کردووە بەبێ عوزر تاکو کاتی نوێژەکە بەسەر دەچێ جگە لە تۆ کەسی تر نوێژەکە ناکات لەجیاتی تۆ**

**گەر نوێژت کرد ئەوا باشە ئەگینا استتابەت دەکەین گەر تەوبەت کرد باشە ئەگینا دەتکوژین هەروەک چۆن کەسێک کوفر دەکات و کافر دەبێ پێی دەڵێین**

**گەر ئیمان بهێنی باشە ئەگینا دەتکوژین وە ووتراوە استتابە دەکرێ سێ جار گەر نوێژی کرد ئەوا باشە ئەگینا دەکوژرێ ئەمەش شتێکی چاکە ان شاء الله.**

**(مختصر المزني ٣٤)**

**١٧٢/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**زۆر لە برا ئەکرێت کە نەفەقە و بژێوی خوشکەکەی بگرێتە ئەستۆ ئەگەر خوشکەکەی پێویستی پێ بوو.**

**(زاد المسافر لغلام الخلال ٣٠٩١)**

**١٧٣/ ئیمامی علي اَبن المديني دەڵێ ئیمامی مالیك أمير المؤمنين بوو لە حدیثدا**

**أبو قدامة دەڵێ ئیمامی مالیك حافظ ترین کەسی زەمەنی خۆی بوو**

**يحيى بن سعيد دەڵێ ئیمامی مالیك ئیمام بوو لە حدیثدا**

**بۆیە ئیمامی الشافعي دەڵێت ئەگەر مالك و سفيان نەبووایەن ئەوا علمی حجاز نەدەما.**

**(مناقب مالك بن أنس ، أبي الحسن علي بن الحسن المالكي المتوفي ، 440)**

**١٧٤/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**باشترین کەسەکانی دوای رسول الله ﷺ أبو بكر ـە دواتر عمر ـە دواتر عثمان ـە دواتر علي ـە ڕەزای خوایان لێبێ.**

**(حلية الأولياء (٩/١١٤)**

**١٧٥/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**خەڵکی پێویستیان بە زانستە وەک نان و ئاو چونکە زانست هەموو کاتێک پێویستت پێی دەبێت بەڵام نان و ئاو جارێک یا دوو جار پێویستت دەبێت هەموو ڕۆژێک.**

**(طبقات الحنابلة ١/١٤٦)**

**١٧٦/ پیاوێک لە ئیمامی مالیکی پرسی ئایا ئیمانداران لە قیامەتدا الله تعالی ئەبینن؟**

**وتی ئەگەر ئیمانداران نەیانبینیایە ئەوە الله تعالی حیجابێکی دانەدەنا لە نێوان خۆی و کافرەکاندا وە وتی ( كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ )**

**(شرح أصول إعتقاد أهل السنة والجماعة)**

**(مەبەستی ئیمام مالک ئەوەیە ئەگەر الله تعالی کافرەکان عەزاب بدات بەوەی کە خۆی پیشانیان نەدات ئەوە فەزڵ ئەکات بەسەر ئیمانداراندا بەوەی کە خۆی پیشانیان بدات والله اعلم)**

**١٧٧/ ئیمامی شافعی وتی**

**کۆ کراوەی هەموو چاکەیەك دوور کەوتنەوەیە لە خراپە.**

**(كتاب الإمام الشافعي)**

**١٧٨/ ئیمامی أحمد بن حنبل ده‌یووت**

**إبراهيم بن طهمان له خه‌ڵكی خۆراسان بوو له نه‌یسابور كه‌سێكی مورجیئه بوو توند بوو له‌سه‌ر جهمیه‌كان.**

(تاريخ بغداد ٦/١٠٨)

**١٧٩/ مه‌ذهه‌بی ئه‌هلی حه‌دیث (سوننه و جه‌ماعه) بریتیه له‌وه‌ی كه ئیمان وته و كرده‌وه‌یه زیاد ده‌كات به گوێرایه‌ڵی كردن كه‌م ده‌كات به سه‌رپێچیكردن (ى الله تعالى).**

**پرسیارم له هشام بن حسان إبن جريج سفيان الثوري المثنى بن الصباح محمد بن عمرو بن عثمان محمد بن مسلم الطائفي فضيل بن عياض نافع بن عمر الجمحي سفيان بن عيينة وليد بن مسلم وتى گوێم له الأوزاعي و ئیمام مالیكی كوڕی ئه‌نه‌س و سعيد بن عبد العزيز بوو ده‌یانوت ئیمان به‌بێ كرده‌وه نییه.**

(تحقيق عقيدة السلف وأصحاب الحديث (ص : ١١١ - ١١٦))

**١٨٠/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێت**

**مشتومڕیم له‌گه‌ڵ هیچ كه‌س نه‌كردوه ئیللا له‌سه‌ر نه‌سیحه‌ت نه‌بێت.**

(حلية الأولياء (٩/١١٨))

**١٨١/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ ئه‌و كه‌سه‌ی واز له‌نوێژی ویتر بهێنێت ئه‌وا پیاوێكی خراپه وه نابێت شایه‌تی لێ وه‌ربگیرێت.**

( البناية شرح الهداية /٤٧٣)

**١٨٢/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**ئاگاتان لە بیدعە بێ وتیان ئەی باوکی عبدالله بیدعە چییە ؟**

**فەرمووی ئەهلی بیدعە ئەوانەن کە لە ناو و صیفات و قسە و عیلم و قودرەتی الله تعالی قسە دەکەن لە ئەو شتە بێدەنگ نابن کە صەحابە و تابیعیەکان لێی بێدەنگ بوون.**

**(تحقيق عقيدة السلف وأصحاب الحديث (ص ٨٣ ))**

**١٨٣/ ئیمامی شافعی وتی**

**ڕیابازی لەزانستدا دڵەکان ڕەق دەکات وە ڕك و کینە جێ نشین دەکات.**

**(الآداب الشرعية لابن مفلح (١/٢٠٢)**

**١٨٤/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**پەنجا ساڵ عیبادەتم کرد شیرینی ئیمانم نەچەشت تا وازم لە سێ شت نەهێنا**

**وازم لە ڕازی کردنی خەڵکی هێنا بۆیە توانیم حەق بڵێم**

**وازم لە مەجلیسی خراپەکاران هێنا و چوومە مەجلیسی پیاوچاکان**

**وازم لە شیرینی دونیا هێنا ئیتر شیرینی قیامەتم دەست کەوت.**

**(سير اعلام النبلاء(١١_٣٤))**

**١٨٥/ إسحاق فەرمووی ئەمیر عبدالله بن طاهر پرسیاری لێ کردم ئەی باوکی یەعقوب**

**ئەو فەرموودەیەی کە ڕیوایەتی ئەکەی لە رسول اللهﷺ ـەوە (پەروەردگاری ئێمە هەموو شەوێک دادەبەزێتە ئاسمانی دنیا) چۆن دادەبەزێت؟ إسحاق فەرمووی الله تعالی ئەمیر شکۆمەند بکات لە بەرامبەر کاری الله تعالی ـدا ناوترێت (چۆن) چونکە چۆنیەتی دابەزینەکەی نازانین.**

**پرسیارێکی هەمان شێوە لە ئیمامی مالیک ئەکرێت پێی ئەوترێت ئەی باوکی عبدالرحمن چۆن دادەبەزێت؟ ئایا بەو عەرش لێی خاڵی نابێت؟ ئیمامی مالیک ئەفەرمووێت (چۆنی بوویێت ئاوا دادەبەزێت).**

**پرسیارێکی هەمان شێوە لە ئیمام مالیک ئەکرێت ئیمام مالکی لە وەڵامدا ئەفەرمووێت ئەگەر فەرموودەیەکت بۆ هات لە رسول الله ـەوە ﷺ گوێی بۆ بگرە.**

(تحقيق عقيدة السلف وأصحاب الحديث ٦٥ ـ ٦٦ ـ٦٧)

**(دەڵێم مەبەست ئەوەیە باوەڕمان بەوە سیفەتی النزول ی الله تعالی هەبێت بەبێ ئەوەی بیشوبهێنین بە دابەزینی دروستکراوەکانی وە بەبێ ئەوەی بڵێین چۆنیەتی دابەزینەکەی بەو فلان شێوەیەیە)**

**(لەگەڵ ئەوەشدا بابەتێک هەیە کە سەلەف هیچ قسەیەکیان تێدا نەکردووە ئەویش (ئایا کە دێتەخوارەوە عەرش لێی خاڵی ئەبێت؟)**

**(ئەم بابەتە سەلەف بە هیچ جۆرێک قسەیان تێدا نەکردووە بەڵکو بەو شێوازە باوەڕیان پێ کردووە کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتووە).**

**١٨٦/ ڕه‌بیعی قوتابی شافعی ده‌ڵێت شافعی ئه‌م شیعره‌ی بۆ خوێندمه‌وه**

**كُلُّ العَداوَةِ ترجى إماتَتُها إلاّ عَداوَةَ مَنْ عاداكَ بِالحَسَدِ.**

**هه‌موو دوژمنایه‌تیه‌ک ئومێدی نه‌مان و مردنی لێده‌كرێت**
**جگه له دوژمنایه‌تی كه‌سێک به هۆی حه‌ساده‌ته‌وه دوژمنایه‌تیت كات.**

**(الطيوريات ٣/١١٦٤)**

**١٨٧/ ئیمامی أحمد ی كوڕی حنبل ده‌ڵێ**
**شه‌ش كه‌س هه‌موو به‌ره‌به‌یانیه‌ک دوعایان بۆ ده‌كه‌م شافعی یه‌كێكیانه.**

**(طبقات الحنابلة لأبي يعلى (١/٢٨٣)**

**١٨٨/ ئیمامی شافعي رحمه الله ده‌ڵێ چوار شت ژیری زیاد ده‌كات**
**١ / واز هێنان له قسه‌ی زیاده.**
**٢ / سیواك كردن.**
**٣ / دانیشتن له‌گه‌ڵ پیاوچاكان.**
**٤ / دانیشتن له‌گه‌ڵ زانایان.**

**(زاد المعاد لابن القيم الجوزية (٤/٣٧٦))**

**١٨٩/ جعفری کوڕی عبداللە وتی**

**پیاوێک هات بۆ لای ئیمامی مالیکی کوڕی أنس و پرسیاری لەبارەی ئەم ئایەتە لێ کرد| الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ |**

**جعفر وتی نەمبینیبوو ئیمام مالیك بە قسەیەک تووڕە بێت وەک لەو پرسیارە تووڕە بوو ئارەقی کردەوە بێدەنگ بوو و سەری نزم کردەوە و تەماشای زەویەکەی ئەکرد ئەوانەی لەوێ بوون چاوەڕێی ئەمری ئیمامی مالیك بوون لەبارەی پیاوەکە دواتر ئیمامی مالیك هێور بوویەوە و وتی**

**چۆنیەتیەکەی نەزانراوە مانای إستواء دیارە ئیمان هێنان پێی واجبە پرسیارکردن لەباریەوە بیدعەیە وە من ئەترسم تۆ گومڕا ببیت**

**دواتر فەرمانی کرد بیکەنە دەرەوە.**

(تحقيق عقيدة السلف وأصحاب الحديث (ص : ٤٢))

**(دەڵێم ئیمام ئەفەرمووێت ئیمان هێنان پێی واجبە جەهمی و موعتەزیلە و ئەشعەریە کافرەکان ئەوە بە کافر ئەزانن کە ئیمانی پێیەتی)**

**(ئیمام ئەفەرمووێت پرسیارکردن دەربارەی بیدعەیە کەچی ئەهلی کەلام بە قیاساتە بەتاڵ و مێشکە پووچەکانیان لەو بابەتانەدا قووڵ ئەبنەوە و بە کەیفی خۆیان قسەی تیا ئەکەن)**

**١٩٠/ ئیمامی احمد ی کوڕی حنبل دەڵێ پرسیارم لە ئیمامی شافعی کرد دەربارەی قیاس فەرمووی**

**لە کاتی زۆر پێویست (جائیزە)**

**(ذم الكلام للهروي (٣/٣٠))**

**١٩١/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**لە بەغدا دەرچوم هیچ کەسێکم لە دوای خۆم جێ نەهێشت ژیرتر و بەتەقوا تر و فەقیهـ تر لە أحمد ی کوڕی حنبل.**

**(مناقب الإمام أحمد (١٤٣)**

**١٩٢/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**دەست بگرن بەهاوەڵانی حەدیث چونکە ئەوان لە هەموو خەڵک لە ڕاستی نزیکترن.**

**(ذم الكلام للهروي (٣/٢٦)**

**١٩٣/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**ئەو کۆمەڵەیە ئەیانویست ڕەخنە لە رسول الله ﷺ بگرن بەڵام نەیانتوانی ڕەخنەی لێ بگرن هەر بۆیە ڕەخنەیان لە هاوەڵانی گرت هەتا بە رسول الله ﷺ بوترێت کەسێکی خراپ بووە ئەگەر خۆی باش بووایە ئەوە هاوەڵانیشی باش ئەبوون.**

**(الصارم المسلول)**

**١٩٤/ پرسیاریان له‌ ئیمامی احمد كرد سه‌باره‌ت به‌ جه‌نگ كردن له‌گه‌ڵ دزو جه‌رته‌كاندا**

**فه‌رمووی هه‌ر كه‌سێک كه‌ دێت ماڵت به‌رێ (ناموست) یان نه‌فست (خوێنت برێژێ) تۆ بۆت هه‌یه‌ دیفاع له‌ نه‌فسو ماڵت بكه‌یت.**

**(السنه الخلال١٤٢)**

**١٩٥/ الزنجي مسلم بن خالد به‌ شافعی ئه‌وت**

**فه‌توا بده‌ ئه‌ی باوكی عبدالله‌ چونكه‌ به‌خوا كاتی ئه‌وه‌ هاتووه‌ فه‌توا بده‌یت وه‌ ئه‌ویش له‌ ته‌مه‌نی پانزده‌ ساڵان بوو.**

**(حلية الأولياء)**

**١٩٦/ ئیمامی مالیك ده‌ڵێ**

**ئه‌وه‌ی پێچه‌وانه‌ی سوننه‌تی رسول الله ﷺ بجولێته‌وه‌ ئه‌ترسم تووشی فیتنه‌ بوبێت چی له‌و فیتنه‌یه‌ گه‌وره‌ تره‌ كه‌ تۆ خۆت ده‌بینی پێش ده‌كه‌ویت بۆ كارێكی چاكه‌ كه‌ رسول الله ﷺ نه‌چووه‌ بیكات ئینجا ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه‌**

**( فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)(النور63)**

دەبا ئاگادار بن ئەوکەسانەی کە پێچەوانەی فەرمانی ئەو رسول الله ﷺ رەفتار دەکەن کە تووشی فیتنە ببن یان توشی سزایەکی سەخت.

(الجامع في العقائد١٧٦)

١٩٧/ ئیمامی أحمدی کوڕی حنبل دەڵێ

هیچ کەسێک نیە دەستی دابێتە پێنووس و قەڵەم ئیللا ئیمامی شافعی منەتی هەیە لە گەردنی.

( سير أعلام النبلاء (١٠/٤٧)

١٩٨/ ئیمامی شافعی دەڵێ

ئەگەر پێنووسەکان نەبوونایە زندیقەکان وتاریان دەدا لەسەر مینبەرەکان.

(ذم الكلام للهروي (٣/٣٤))

١٩٩/ ئیمامی مالیک دەڵێ

گەر ئەبو حەنیفە بە شمشێر خروجی کردبووایە لەسەر ئەم ئوممەتە هێشتا سووکتر بوو لەو قیاس و ڕەئیەی کە دەریدەخست تیایدا.

(جامع بيان العلم وفضله : ٢١٠٣)

(تەبعەن گومان لە مورجیئە بوونی ابو حنیفە نیە چونکە عەمەلی لە ئیمان دەرئەکرد ئەهلی سوننە بە ئەهلی ڕەئی و مورجیئە باسیان کردووە)

٢٠٠/ ابن هانئ وتوویه‌تی پرسیاركرا له ئیمامی احمد ده‌رباره‌ی ابو حنیفه ئایا ریوایه‌ت ئه‌كرێت لێیه‌وه؟

فه‌رمووی نه‌خێر.

(مسائل_ابن هانئ)

٢٠١/ عبدالخالق بن منصور ده‌ڵێ گوێم له احمد بن حنبل بوو ده‌یووت

هه‌ركه‌سێك ( كتاب الحيل ) ی (ابو حنیفه) له‌ماڵ هه‌بێت فه‌توای پێ بدات ئه‌وه كافر بووه به‌وه‌ی بۆ محمد ( صلی الله علیه وسلم ) دابه‌زیوه .

(بيان الدليل على بطلان التحليل ١٢٩ )

٢٠٢/ ئیمامی عبدالله‌ی كوڕی موباره‌ك ده‌ڵێ

هه‌ركه‌سێك بڕوانێته كتابی (الحیل)ی ابو حنیفة ئه‌وا ئه‌وه‌ی الله حه‌رامی كردووه حه‌ڵاڵی ده‌كات وه ئه‌وه‌شی الله حه‌ڵاڵی كردووه ئه‌و؟حه‌رامی ده‌كات.

(تاريخ بغداد (١٥/٥٥٥))

٢٠٣/ النضر ابن شميل ده‌ڵێ

له كتابی الحیل دا ئه‌وه‌نده‌و ئه‌وه‌نده بابه‌تی تێدایه هه‌مووی كوفره .

(تأريخ بغداد ١٥ / ٥٥٦)

**٢٠٤/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئەو كتێبەی كە ئەبو حەنیفە و هاوەڵانی دایانناوە بە مەبەستی شكاندنی سوننەتە هەرچی حەرامە حەڵاڵیان كردوە هیچ شێك لەو كتێبە ڕاست نیە و نابێت بخوێنرێتەوە .**

**(طبقات الحنابلة ٢ /١٥١ )**

**٢٠٥/ إبراهيم الحربی لەبارەی ئیمام أحمد دەڵێ**

**ئەوبوو خستیە دڵمانەوە كاتێک منداڵ بوین شوێن فەرمودەكانی رسول الله ﷺ و قەولەكانی هاوەڵان بكەوین و وە شوێن پێی تابعین هەڵبگرین.**

**(طبقات_الحنابلة (١_٢٣٤)**

**(شوێنكەوتوانی ابو حنيفە شانازی پێوە ئەكەن كە ئەهلی ڕەئیە و لە حدیثا ضعیفە بەڵام شوێنكەوتوانی ئیمام احمد شانازی بە حدیثەوە پێ ئەكەن ئەوەی ئیمام و پێشەوایە تەنها ئەهلی حدیثن نەک ئەهلی ڕەئی و كەلام)**

**٢٠٦/ ئیمامی ئەوزاعی**

**كاتێک أبو حنيفە مرد فەرمووی حەمد بۆ ئەو الله یەی كە مراندی چونكە ئەو پایەكانی ئیسلامی پایە پایە هەڵئەوەشاند.**

**(السنه عبدالله ٣٠٦)**

**٢٠٧/ إبی إسحاق دەڵێ ئێمە لەلای سفيان الثوری بوین كاتێك هەواڵی مردنی أبو حنیفە هات فەرمووی سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە موسڵمانانی ئیسراحەت پێكرد**

له‌و به‌ڕاستی ئه‌و گرێكانی ئیسلامی گرێ گرێ ده‌كرده‌وه هیچ منداڵێك له‌دایك نه‌بوه له ئیسلام شومتر بێت له‌سه‌ر ئیسلام وه‌ك له‌و ابو حنیفة.

(المعرفة والتاريخ_للفسوي_٩٦_٣)

٢٠٨/ حرب الكرمانی ده‌رباره‌ی ابو حه‌نیفه و ئه‌هلی ڕه‌ئی ده‌ڵێ

أصحاب الرَّأي ئه‌مانه بیدعه‌چین و گومڕان دووژمنی سوننه‌ت و ئه‌ثه‌رن پێیان وایه دین به بۆچوون و قیاس و پێ باشبوونه (واتا چ شتێك به‌باش بزانن ده‌یكه‌ن به دین) وه ئه‌وان پێچه‌وانه‌كاری ئاثارن وه فه‌رمووده پووچه‌ڵ ده‌كه‌نه‌وه (بۆ چوونی خۆیان ده‌خه‌نه شوێنی) وه به‌رپه‌رستی رسول الله ﷺ ده‌ده‌نه‌وه

ابو حنیفه و ئه‌و كه‌سه‌شی هه‌مان ووته‌ی ابو حنیفه بڵێت ده‌یكه‌نه پێشه‌وای خۆیان

وه دینداری ده‌كه‌ن به‌و دینه‌ی كه‌وا خۆیان دایانڕشتووه وه ئه‌وه ده‌ڵێن كه‌وا بیروباوه‌ڕیانه

چ گومڕاییه‌ك ڕوونتره له‌وه‌ی كه‌سێك ئه‌م ووته‌یه بڵێت یاخود له‌سه‌ر هاوشێوه‌ی ئه‌م ڕێبازه بێت ؟ واز بهێنێت له ووته‌ی رسول الله ﷺ و هاوه‌ڵانی ، وه شووێن بۆ چوونی اَبو حنیفه و هاوه‌ڵانی بكه‌وێت ؟

ئه‌مه‌نده به‌سه بۆ (هه‌بوونی ڕێبازێكی)چه‌وت و لادان له ڕێگه‌ی ڕاست.

(السنه حرب الكرمانی رقم الأثر١٠٩)

**٢٠٩/ حرب الكرمانی دەڵێ**

**هاوەڵانی ڕەئی موبتەدیع و گومڕان، دوژمنی سوننە و ئەثەرن دین لای ئەوان ڕەئی و قیاس و استحسانە، مخالەفەی ئەثەر دەکەن و فەرموودە هەڵدەوەشێننەوە ڕەددی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم دەدەنەوە وە ابو حنیفە و ئەوەی قسەی ابو حنیفە دەڵێتەوە بە ئیمامی دادەنێن و دینداری بە دینی ئەوانەوە ئەکەن وە وتەکانی ئەوان دەڵێنەوە چ گومڕاییەك ڕوونترە لەوەی کەسێك ئەمە بڵێ یان لەسەر نمونەی ئەمە بێت؟**

**قەولی پێغەمبەر صلی الله علیە و سلم و هاوەڵانی الله لێیان ڕازی بێ تەرك دەکا و شوێن ڕەئی ابو حنیفە و هاوەڵانی دەکەوێ**

**(السنه حرب الكرمانی)**

**٢١٠/ ابن الجوزی دەڵێ**

**کەسانێك تانەیان لە ابو حنیفە داوە بەهۆی مەیل هەبوونی بۆ ڕەئی کە پێچەوانەی فەرموودەی صحیحە وە هەندێك خەڵك عوزریان بۆ دەهێنایەوە و دەیانوت فەرموودەی پێنەگەشتووە ئەمەش قسەیەکی پوچە لەبەر دوو شت یەکەمیان کەسێك زۆربەی فەرموودە صەحیحەکانی لێ شاراوە بێت بۆی نیە فەتوا بدات دووەمیان ئەو کاتێك فەرموودەی پێ بووترایە پێچەوانەی قسەی خۆی بێت لە قسەکەی خۆی پەشیمان نەدەبویەوە.**

**(المنتظم ١٣٥/٨)**

**٢١١/ فریابی دەڵێ سفیان**

**نەهی دەکرد لەوەی سەیری ڕاو بۆچونی أبو حنیفە بکرێ.**

**(تاریخ بغداد ٥٥٨)**

**٢١٢/ إسماعيل بن أبي أويس وتی**

**خاڵم مالک بن أنس پێی وتم ئەبو حەنیفە لە دەردە بێ دەرمانەکانە وە مالک وتی ئەبو حەنیفە فەرموودەکان هەڵئەوەشێنێتەوە.**

(السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد ٢٨١)

**٢١٣/ شريک بن عبدالله القاضي وتی**

**ئەگەر هەموو ماڵێک لە ماڵەکانی کوفە عەرەق فرۆشی تێدابێت و عەرەق بفرۆشێت باشترە لەوەی کەسێکی تێدا بێت کە قسەکانی ئەبو حەنیفە بکات .**

(السنة لـ عبدالله بن الإمام أحمد ٢٨٧)

**٢١٤/ - ئیمام أحمد دەڵێ**

**ئەهلی خۆراسان تاقیکرانەوە بە ئەبو حەنیفە.**

(مسائل الإمام أحمد وابن راهويه ٣٤٤٠)

**٢١٥/ أبو داود السجستاني دەڵێ**

**گوێم لە أحمد بوو وتی سفيان بن عيينة وتی هاوەڵانی ڕەئی ئەهلی ڕەئی سیانن عثمان لە بەسرە وە ربیعة لە مەدینە وە أبو حنيفة لە کوفە .**

(مسائل الإمام أحمد روايه أبو داود السجستاني ١٧٧٦)

٢١٦/ أبو بكر الأعين دەڵێ

گوێم لە أحمد بن حنبل بوو ئەیوت لە هیچ کەسێکیانەوە مەنووسەرەوە و هیچ ڕێز و کەرامەتێکیان نییە واتە هاوەڵانی أبو حنیفة.

(الكامل في الضعفاء : ١٦٥٨، وموسوعة أقوال الإمام أحمد بن حنبل في رجال الحديث وعلله : (٣/ ٢٥٣))

٢١٧/ أبو بكر الأثرم وتی

چەندین جار بینیم أبو عبدالله ئیمام احمد ئەبو حەنیفە و مەزهەبەکەی عەیبدار ئەکرد وە هەندێک لە وتەکانی ئەگێرایەوە بۆ سەرزەنشتکردن و سەرسووڕمان.

(تأريخ بغداد ١٥/٥٦٨)

٢١٨/ محمد بن بشار البندار دەڵێ

عبدالرحمن بن مهدي هیچ کاتێک ناوی ئەبو حەنیفە ی نەئەهێنا ئیللا ئەیوت لە نێوان ئەبو حەنیفە و حەقدا بەربەست هەیە.

(الضعفاء لـ العقيلي ٦/١٦٠)

٢١٩/ أبو بكر ی کوڕی أبو داود ی السجستاني ڕۆژێک بە هاوەڵانی وت

چی ئەڵێن دەربارەی بابەتێک کە ئیمامی مالیك و هاوەڵانی و ئیمامی شافعی و هاوەڵانی و الأوزاعي و هاوەڵانی و الحسن بن صالع و هاوەڵانی و سفيان الثوري و هاوەڵانی و أحمد بن حنبل و هاوەڵانی لەسەر کۆک بن؟ پێیان وت ئەی أبو بكر هیچ بابەتێک لەم بابەتە ڕاستر نییە وتی هەموو ئەمانە کۆک بوون لەسەر بەگومڕادانانی أبو حنيفة.

(تأريخ بغداد ١٥/٥٢٧)

**٢٢٠/ ئیمامی مالیك رحمه الله دەڵێ**

**ئەبو حەنیفە دینی ڕووخاند ئەوەی دین بڕوخێنێت بێ دینە.**

**(الضعفاء للعقيلي (٦/١٥٧))**

**٢٢١/ إبن تيمية دەڵێ**

**زۆربەی ئەهلی حەدیث تانەیان دا لە ئەبو حەنیفە و هاوەڵەکانی تانەدانێکی بەناوبانگ کە کتێبەکانی پڕ کرد تا کار گەیشتە ئەوەی هیچ شتێکیان لێ ڕیوایەت نەکەن لە کتێبەکانی فەرموودەدا هیچ ناویان نییە لە الصحيحين و سوننەنەکان.**

**(الرد على السبكي في مسألة تعليق الطلاق ٨٣٧)**

**٢٢٢/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**بەردەوام کاروباری دین ڕێک بوو هەتاکو ئەبو حەنیفە دەرکەوت و دەستی دایە قیاس جا نە سەرفراز بوو نە سەرکەوتوو.**

**(جامع بيان العلم وفضله ٢١٠٢)**

**(ئەم بابەتەی ئەبو حەنیفە بە کورتی بوو ئەمانە قسەی ئێمە نیە بەڵکو قسەی ئەهلی سوننەبوو دەربارەی ابو حنيفە بۆیە ئەم قەولانەم هەنێک دانا بۆ ئەوەی خەڵک بزانێ هۆکار چیە گرینگی بە ابو حنيفە نەدراوە شتە شاراوەکان بۆیان بە دیار بکەوێت)**

**٢٢٣/ عبدالله ی كوڕی ئیمام أحمد دەڵێ**

**وتم بە باوکم پیاوێک کەوتۆتە ناو بابەتێکەوە وە لە شارەکەی پیاوێکی لێیە لە ئەهلی فەرمودە بەڵام لە فەرموودەکانی لاوازی هەیە وە فەقیهێکی لە ئەهلی ڕەئی لێیە پرسیار لە کامیان بکات ؟**

**فەرمووی پرسیار لە ئەهلی ڕەئی ناکات کەسێک لە فەرمودەدا لاوازبێت خێری زیاترە لە کەسێک ڕەئی بەهێزبێ.**

**(ذم الكلام للهروي ٣٣٣)**

**٢٢٤/ حرب بن إسماعيل دەڵێ وترا بە ئیمامی احمد**

**پیاوێک کێشەیەکی بۆ هاتۆتە پێش کەسی دەست نەکەوت پرسیاری لێ بکات ئایا پرسیار لە ئەهلی ڕەئی بکات ؟**

**فەرمووی پرسیار لە ئەهلی ڕەئی ناکات لە هیچ شتێک هەرگیز.**

**(ذم الكلام للهروي ٤١٣)**

**٢٢٥/ شريک دەڵێ**

**ئەثەرێک تێیدا هەندێک لاوازی تێدا بێت خۆشەویست ترە لەلام لە ڕاو بۆچوون. (کەسێک بە ڕاو بۆ چونی خۆی قسە بکات نەك بە دەلیل ئەمە ئەهلی ڕەئیە)**

**(ذم الكلام للهروي ٤١٣)**

**٢٢٦/ ئیمامی شافیعی دەڵێ**
**جائیز نیە بۆ هیچ یەکێک لە ئەهلی ڕەئی کە فتوا بدات.**

**(ذم الكلام للهروي ٣٥٩)**

**٢٢٧/ حرب دەڵێ پرسیار کرا لە أحمد دەربارەی سەیرکردنی ڕاو بۆچون بە خراپی دانا وە نەهی لێ کرد.**

**ئیمامی أحمد دەڵێ هەر چ کەسێ سەیری ڕەئی ابو حنيفه بکات ئیللا کەسێک دڵی وەک داستان جەنگەڵ بێ ئەچێ بۆ لای ڕەئیەکە .**

**(أحكام أهل الملل ٨٣٥ )**

**٢٢٨/ محمد بن یاسین دەڵێ پرسیار کرا لە ئیمامی احمد دەربارەی سەیرکردن بۆ ڕاو بۆچوون ؟**
**ئیمامی احمد فەرمووی پابەندبن بە سوننەتەوە**

**پێم ووت ئەی باوکی عبدالله خاوەن فەرمودە سەیری ڕاو بۆچون بکات بۆ ئەوەی بزانێ کامە ڕاوبۆچون پێچەوانەیەتی ؟**

**فەرمووی پابەندبن بە سونەتەوە.**
**(واتە دوور بکەونەوە لە ڕاو بۆچون)**

**(طبقات الحنابلة ٢/٣٨٣)**

**٢٢٩/ ئیمامی أحمد ده‌ڵێ**

**هه‌ركه‌سێ بڕوات بۆ لای خاوه‌ن ڕاو بۆچونێک بۆ ئه‌وه‌ی فتوای بۆ بدات بێگومان هاوكاری كردووه له ڕوخاندنی ئیسلام.**

**(طبقات الحنابلة ١/٥٤ )**

**٢٣٠/ صه‌حابه‌ی به‌ڕێز عبدالله‌ی كوڕی مه‌سعود ( رضی الله عنه ) ووتی**

**ووريابن له وام پێ باشه وام پێ باشه چونكه به‌ڕاستی ئه‌وانه‌ی پێش ئێوه تیاچوون به هۆی وام پێم باشه وام پێ باشه وه هیچ شتێكیش قیاس مه‌كه‌ن به شتیكی تر دواجار پێتان بخلیسكێت پاش جێگیربوونی.**

**(السنه حرب الكرمانی ٥٩٥)**

**(مه‌به‌ستی ئه‌هلی ڕه‌ئیه چونكه به ڕه‌ئی خۆیان فتوا ده‌ده‌نو قسه ده‌كه‌ن ده‌ڵێن به ڕه‌ئی خۆم واو وا ئینجا چه‌ند قه‌ولێكم دانا سه‌باره‌ت به‌م بابه‌ته بۆ ئه‌وه‌ی زیاتر ووشیار ببنه‌وه الله تعالی هیدایه‌تی منو ئێوه‌ش بدات).**

**٢٣١/ ئیمامی احمد رحمه الله ده‌ڵێ**

**هه‌ركه‌سێك ووتی له‌فزی من بۆ قورئان مخلوقه ئه‌وا كافره**

**وه هه‌ركه‌سێک ووتی له‌فزی من بۆ قورئان غیر مخلوقه مبتدعه و قسه‌ی له‌گه‌ڵ مه‌كه‌ن.**

**(كتاب السنة الخــلال ٢١٢٢)**

**٢٣٢/ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ١١٩ هود**

**ئـەهلی بەزەیی ئـەهلی سوننـەن**

**ئیمامی مالیك لە تـەفسیری ئـەم ئایەتە دەڵێ**

**خاوەن بەزەییەکان جیاوازیان تێدا نیە.**

**(سنن لسعيد بن منصور : ١١٠٤)**

**٢٣٣/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئـەگەر سوننـەتێکی رسول الله ـتان دۆزیـەوە ﷺ شوێنی بکەون وە ئاور مەدەنەوە لە کەس.**

**(ذم الكلام للهروي (٣/١٥))**

**٢٣٤/ پیاوێک وتیە ئیمامی احمد**

**چۆن دڵم نەرم دەبێت؟**

**ئیمام احمد فەرمووی بە چوونت بۆ گۆڕستان وە دەست بهێنە بەسەری هێتیم.**

**( طبقات الحنابلة ٣٩/١ )**

**٢٣٥/ ئیمامی مالیک رحمه الله سەبارەت بە نوێژ کردن لە دوای ئیمامێکی قەدەریەوە**

ئەویش وتی ئەگەر داوای فتوا له من دەکەیت ئەوە نوێژی لە دواوە مەکە کەسی پرسیارکەر وتی نوێژی جومعەشی لە دواوە نەکەم ؟
وتی بەڵێ نوێژی جومعەشی لەدواوە مەکە
وە پێم باشە ئەگەر لێی دەترسیت ترسی ئەوەت هەیە ئازارێکت پێبگەیەنێت ئەوە نوێژی جومعەی لەدواوە بکە و دواتر نوێژی نیوەڕۆ بکەرەوە.

(المدونه الکبری ١ / ٨٤)

**٢٣٦/ یونس الصدفي دەڵێ**

له شافعی ژیرترم نەبینیوە ڕۆژێک لە بابەتێکدا مشتومڕم لەگەڵدا کرد دوایی یەکترمان جێهێشت و دواتر منی بینیەوە و دەستی گرتم پێی ووتم ئەی باوکی موسا ئایا ناکرێت ئێمە برا بین ئەگەر بێتو لەسەر بابەتێکیش ڕێک نەکەوین.

(سير أعلام النبلاء)

**٢٣٧/ پرسیار کرا له ئیمامي احمد**

پیاوێك کراوەتە وەلي بۆ خوشك و کچەکەی پێی دەڵێت ئەگەر کەسێکت دي پێی ڕازي بوویت بیاندە
بەشوو ئیمام فەرمووي

زەواجەکە دروستە.

(مسائل الإمام احمد بن حنبل ریوایة ابی القاسم البغوي)

**٢٣٨/ ئیمامی مالیک دەفەرموویّت**

**هەر هەڵەیەک لە نوێژدا ئەگەر کەم کردنەوە بێت{واتە شتێک لەنوێژەکەی کەم بکات} ئەوا سوجدەی سەهوەکەی لەپێش سەلامدانەوەیە،**

**وە هەر هەڵەیەک لەنوێژدا زیاد کردن بێت{واتە شتێک لەنوێژەکەیدا زیاد بکات} ئەوا سوجدەی سەهوەکەی لەدوای سەلامدانەوەیە.**

**(موطأ مالك ابن انس ٦١_١)**

**٢٣٩/ پێشەوا الحُمَيْدِيّ دەڵێ**

**لەگەڵ شافعی لە مەککە چووین بۆ میسر من سوودم لێوەرئەگرت لە مەسائیلە فیقهیەکان ئەویش سوودی لێم وەرئەگرت لە فەرموودە.**

**(كتاب مناقب الشافعي (٢/١٥٣)**

**٢٤٠/ ئیمامي أحمدم بینی کاتێك لە نوێژ سەلامی دەدایەوە**

**رِوخساري وەردەگێرا لە قیبلەو دادەنیشت و زیكري الله ی دەركرد**

**(مسائل الإمام أحمد بن حنبل ريوايه ابی القاسم البغوي)**

**٢٤١/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**ئیمامی مالك هەرکاتێك بیدعەچیەك بهاتایە و بیویستایە موناقەشەی لەگەڵدا بكات ئەوە ئیمامی مالك بەو کەسەی دەفەرموو من لەسەر ئاین و ڕێبازی خۆمم بە چاو ڕۆشنی و بەڵگەوە وە گومانم نیە لە ڕێبازەکەم بەڵام ئەوە تۆیت گومانت**

هەیە لە ڕێبازەکەت بۆیە بڕۆ بە دوای کەسێکی وەك خۆت بگەڕێ کە وەك خۆت گومانی هەبێ لە ڕێبازەکەی و موناقەشەی لەگەڵ بکە.

(سير أعلام النبلاء ٧/١٨٠)

**٢٤٢/ الربيع ی کوڕی سلیمان دەڵێ**

**ئیمامی شافعی هەموو مانگێک قورئانی خەتم دەکرد.**

(آداب الشافعي ومناقبة (٧٠))

**٢٤٣/ پرسیار کرا لە ئیمامي احمد**

**دەربارەي سڕِینی شوێنەواری دەست نوێژ لەدواي دەست نوێژ؟**

**ئیمام أحمد بەباشی نەزانیی.**

(مسائل الإمام أحمد بن حنبل ريواية ابى القاسم البغوي)

**٢٤٤/ سحنون دەڵێ**

**ئیمامی مالیك دەربارەی فرۆشتن و کڕینی موسحەف وتوویەتی ئاساییە.**

(المدونة الكبرى : ٣/٤٣٠)

**٢٤٥/ ئیمامی شافعی رحمه الله دەڵێ**

**بیست ساڵە تێرم نەخواردوە لەبەر ئەوەی تێربوون جەستە قورس دەكات وە دڵ تووند دەكات وە ژێری ناهێڵێ وە خەو دێنێ وە خاوەنەكەی ماندوو دەكات لە ئەنجامدانی عیبادەت.**

(آداب الشافعي ومناقبه (١٠٦))

**٢٤٦/ ئیمامی أحمد رحمه الله دەڵێ**

**هەركەسێک بمرێ لەسەر إسلام و سوننەت**

**ئەوا مردووە لەسەر هەموو خێرێک.**

(سیر إعلام النبلاء ١١-٢٩٦)

**٢٤٧/ ئیمامی مالیك رحمه الله بە القعنبی وت**

**بە هەر شتێك یاری ـت كرد نەكەی یاری بكەیت بە دینەكەت.**

(ترتیب المدارك وتقریب المسالك، ٢/٦٥)

**٢٤٨/ پێشەوا النَّسَوِيّ دەڵێ حرملة وتی پرسیاركرا لە ئیمامی شافعی دەرباری**

**ئافرەتێک خورمایەكی لە دەم دایە مێردەكەی پێی دەڵێ ئەگەر بیخۆیت تەڵاق دراوی وە ئەگەر نەیخۆیت تەڵاق دراوی وە ئەگەر فڕێبدەیت تەڵاق دراوی چی بكات؟**

**ئیمامی شافعی فەرمووی باشترین شت بیكات بەشێكی بخوات و بەشێكی بهێڵێتەوە و بەشێكی فڕێ بدات.**

(طبقات الشافعية للعثماني (٣٣١))

**٢٤٩/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**کاتێك دەبینم کەسێک شتێک لە سوننەت دا زیندوو دەکاتەوە دڵم پێ خۆش دەبێت.**

**(السير الذهبی ٣٥/١١)**

**٢٥٠/ ئیمامی مالیک بە لاوێكی قورەیشی فەرموو**

**ئەی کوڕی براکەم فێری ئەدەب و خۆڕەوشت بە پێش ئەوەی فێری عیلم و زانست ببی.**

**(حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، ٦/٣٣٠)**

**٢٥١/ پێشەوا أبو حاتم دەڵێ حرملة بۆی گێڕاینەوە وتی**

**گوێم لە شافعی بوو فەرمووی هیچ کەسم نەبینیوە وەکو شیعە شایەتی بە درۆ بدات.**

**(منهاج السنة لابن تيمية (١/٦٠))**

**٢٥٢/ شیخ الإسلام ئیمام احمد بن حنبل رحمه الله فەرموویەتی**

**ئارام گرتن لەسەر هەژاری پلەیەکە تەنها گەورەکان پێی ئەگەن.**

**(کتاب البداية والنهاية 14/392)**

**٢٥٣/ ابن وهب بوو ووتی**

**به خوشکی ئیمامی مالك بن أنس وترا مالك بن أنس چی دەکرد له ماڵەکەیدا وتی موصحەف و خوێندنەوەی.**

**(مقدمة الجرح والتعديل لابن أبي حاتم مجلد ١ صـ١٣٧ ) دار الاستقامة)**

**٢٥٤/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**هیچ عیلمێک نازانم لەدوای فێربوونی حەڵاڵ و حەرام باشتربێت له پزیشک بەڵام جولەکە و گاورەکان پێش ئێمە کەوتوون لەمەدا.**

**(سير أعلام النبلاء (١٠/٥٧))**

**٢٥٥/ پێشەوا حرملة دەڵێت ئیمامی شافعی**

**دەربارەی وازهێنانی موسڵمانان له پزیشک دەیفەرموو سێ بەشی عیلمیان بزر کردوە وە داویانەتە دەست جولەکە و گاورەکان.**

**(كتاب مناقب الشافعي (٢/١١٦))**

**٢٥٦/ پیاوێک داوای له ئیمامی احمد کرد کە ئامۆژگاری بکات ئیمامی احمد فەرمووی**

**کە الله تعالی ڕۆزی تۆی خستۆتە ئەستۆی خۆی ئیتر ترس و دڵەڕاوکێ بۆ ڕزقەکەت لەپای چی؟**

**وەگەر ڕزق هەمووی دابەش کراوە لەنێوانتان ئیتر شڵەژان بۆ؟**

گەر پارەو سامانەكەت لەدەست الله تعالی یە ئیتر ڕەزیلی بۆ؟

وە مادام بەهەشت ڕاستیە پشوودان و ئارامی بۆ؟

وە مادام ئاگری دۆزەخ حەقە ئیتر سەرپێچی بۆ؟
وە مادام پرسیارەكانی نكیر و منكر هەن ئیتر دڵخۆشی واتای چییە؟

وە مادام دونیا تەواو ئەبێ ئەم هەموو ئاسوودەییە بۆ؟

وە مادام لێپێچینەوە حەقە كۆكردنەوەی سامان بۆ؟

وە مادام هەموو شتێكیش بە قەزاو قەدەری خۆیەتی ئیتر دڵ توندی بۆ؟

( المدخل ٣/٢٢٠ )

٢٥٧/ ئیمامی احمد بن الحنبل رحمه الله دەڵێ
ئیمامی مالیك وتی لەگەڵ كەسی جاهیل دانەنیشتووم قەت

وە احمد وتی ئەوە شتێكە جگە لەو كەس لێی پارێزراو نەبووە.

(ترتیب المدارك، ومناقب مالك للزواوي ص١٥٧)

**٢٥٨/ ئیمامی شافعی و هاوه‌ڵه‌كانی ده‌ڵێن**

**باشترین دوعا دوعای ڕۆژی عه‌ره‌فه‌یه وه‌ک له فه‌رمووده‌دا هاتووه.**

**(المجموع شرح المهذب (٦/٣٨١))**

**٢٥٩/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**ئه‌گه‌ر پیاوێک نوێژێکی ڕۆیی وه نه‌یزانی كام نوێژه‌یه‌تی (كه ڕۆشتووه) ئه‌وه هه‌موو نوێژه‌كان ده‌كاته‌وه.**

**(زاد المسافر٢/١٧٩)**

**٢٦٠/ باسێكی كتێبه‌كه‌ی ئیمامی مالیك كتێبی ( الموطأ )**

**هۆكاری ناونانی كتێبی الموطأ له‌لایان ئیمامی مالیک رحمه الله**

**له‌سه‌رده‌می ئیمامی مالیک زانایان كتێبه‌كانیان به‌ناوی جامع یان المؤلف یان المصنف بووه.**

**(تندویر الحوالك(١/٥))**

**٢٦١/ ناونانی كتێبی الموطأ دوو هۆكاری هه‌یه**

**یه‌كه‌م الإمام مالك رحمه‌الله كه كتێبه‌كتی نوسیه‌و بیری له‌وه‌ده‌كرده‌وه كه چ ناوێكی لێ بنێ ئیتر رسول الله صلى الله علیه وسلم ی بینی له‌خه‌وی دا پێی**

فه‌رموو ( وطيء للناس  هذا العلم ) واته بۆخه‌ڵكی ئه‌م زانسته پوخت و ئاسان كه بۆیان جا ناوی لێنا الموطأ.

(مناقب سيد الإمام مالك:١٦)

٢٦٢/ دووه‌م ئیمامی مالیک رحمه‌الله ده‌فه‌رمووێ  ئه‌م كتێبه‌م نیشانی حه‌فتا فه‌قیهـ له فقهاكانی مه‌دینه‌دا هه‌موویان رێیان پێدام له‌سه‌ری(وه رازی بوون) ناوم نا الموطأ.

(تنوير الحوالك:١/٥)

٢٦٣/ ئیمامی شافعی رحمه الله ده‌ڵێ

له‌دوای كتێبی الله عزوجل كتێبێک كه راستر و به‌سوودتر بێ ئه‌وا الموطأ یـ ئیمامی مالیكه.

( تاريخ الخميس ٢/٣٣٢ آداب الشافعي ومناقبه:١٩٦)

٢٦٤/ ابو زرعه الرازی وتی

ئه‌گه‌ر پیاوێک سوێندی خوارد كه ته‌ڵاقم بكه‌وێ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه حه‌دیثه‌كانی ئیمامی مالیک له الموطأ هه‌مووی صحیح ن ئه‌وا ته‌ڵاقی نه‌كه‌وت به‌ڵام ئه‌گه‌ر به غه‌یری حه‌دیثانێك بخوات(غه‌یری الموطأ) ئه‌وا كه‌وتووه.

(وانتصار الفقير السالك ٢١٣)

٢٦٥/ ئیمامی احمد رحمه الله ده‌ڵێ

**چاکترم نەبینیووە( لە الموطأ) کە دەستی پێوە بگری.**

**(مناقب سيدنا الإمام مالك:١٦)**

**٢٦٦/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**نمونەی ئەو کەسەی فێرخوازی عیلم دەکات بەبێ بەڵگە وەکو کەسێکە دار بە شەو کۆدەکاتەوە دارێک هەڵدەگرێت ماری تیایە پێیوەئەدات ئەویش ئاگادار نیە.**

**(کتاب مناقب الشافعي (٢/١٤٣))**

**٢٦٧/ ابن هانئ تەلەبەی ئیمامی احمدی کوڕی حنبل دەڵێ پرسیارم لە ئیمامی احمد کرد**

**دەربارەی کچ کە لە چ کاتێک ئیتر واجب ئەبێت لەسەری بەبێ مەحرەم سەفەر نەکات؟**

**ئیمامی احمد دەڵێ کە بوو بە (٩) ساڵ.**

**(مسائل ابن هانئ ( ١٨٤٣ ))**

**٢٦٨/ لە ایبنو عومەرەوە گێردراوەتەوە رسول الله ﷺ نەهی کردووە لە ژن بە ژنی.**

**ئیمامی مالیك دەڵێ ژن بە ژنی ئەوەیە پیاوێك کچی خۆی لە پیاوێکی تر مارە بکات لەسەر ئەوەی ئەو پیاوەی تر کچی خۆی لەو مارە بکات.**

به ئیمامی دارمی وترا ئایه پێت باشه زەواجیان له نێوان درووست بوبێت ؟ وتی پێم باش نیه.

(سنن الدارمی۲۲۳۱)

۲٦۹/ پێشەوا قتيبة ی كوڕی سعيد دەڵێ ئیمامی **شافعی** مرد وه سوننەتیش لەگەڵی مرد.

(حلية الأولياء (۹/۹٥))

۲۷۰/ ئیمامی **احمد** دەڵێ

تەمەنم ده ساڵان بوو كاتێک دایكم قورئانی پێ لەبەر كردم وه بەیانیان پێش نوێژی بەیانی بانگی دەكردم و ئاوی دەست نوێژی بۆ گەرم دەكردم له شەوه ساردەكانی بەغدا پاشان جلی لەبەر دەكردم خۆشی خیمارەكەی دەپۆشی و لەگەڵم دەهات بۆ مزگەوت چونكه دوور بوو.

(تاريخ بغداد (۲/٦۳))

۲۷۱/ ان وهب وتی

زۆرترین كاتی عیبادەتی ئیمامی **مالك** رحمه الله له كاتی نهێنی به شەو و ڕۆژ بوو كاتێ هیچ كەس نەیبینیایه.

(ترتيب المدارك وتقريب المسالك ۲/٥۳)

**٢٧٢/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**هەرکەسێک ڕاستگۆ بێت لەگەڵ هاوڕێکەی کەمو کورتیەکانی قەبوڵ دەکات وە بۆشاییەکانی دادەخات وە لە هەڵەکانی خۆش دەبێت.**

**(مناقب الشافعي (٢/١٩٤))**

**٢٧٣/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**ئەگەر پێت خۆشە خوا بەردەوامت بکات لەسەر ئەوەی پێت خۆشە ئەوا بەردەوامبە لەسەر ئەوەی خوا پێی خۆشە.**

**(البداية والنهاية ١٠/٣٣٠)**

**٢٧٤/ لە ئیمام مالیکەوە**

**هیچ شەوێ نیە ئیلا رسول الله ﷺ ئەبینم لە خەودا.**

**(حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، ٦/٣١٧)**

**٢٧٥/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**پەروەردگار تبارك وتعالى خوێنو ماڵو سامانی کافری حەڵاڵ کردووە ئیللا ئەگەر باج و جزیە بدات یاخود بۆ ماوەیەک پارێزراو بێت.**

**(كتاب الأم للشافعي (١/٢٦٤))**

**٢٧٦/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**ئەگەر كەسێک باوکی بینی لەسەر کارێک کە بەلایەوە خراپ بوو قسەی لەگەڵ ئەکات بە بێ توندوتیژی و خراپە کردن لەگەڵی و قسەی ڕەقی لەگەڵ ناکات ئەگەر نا با وازی لێ بێنێت باوک وەک کەسی بێگانە نیە.**

**( زاد المسافر ٤/٥٦٦ )**

**٢٧٧/ هیثم بن جمیل دەڵێ بە ئیمامی مالیکم وت**

**ئەی باوکی عبد الله کەسێك شارەزایە لە ڕێبازی ئەهلی سوننە و زیرەکە ئایا بۆی هەیە مناقەشە بکات لەسەر سوننەت و جدال لەگەڵ گومراکان بکات ؟**

**ئیمامی مالیک فەرمووی**

**نەخێر نابێت مناقەشە و جدال بکات بەڵکو حەق ڕون ئەکاتەوە و دەیڵێت ئەگەر لێی قبوڵ کرا باشە ئەگەر نا بێدەنگ ئەبێت.**

**(جامع بیان العلم)**

**٢٧٨/ پێشەوا المزني دەڵێ**

**ماوەی پەنجا ساڵە لە کتێبی الرسالة ـی ئیمامی شافعی ئەڕوانم نەمزانیوە کە هەر جارێک سەیرم کردبێت سوودێکم لێوەرگرتوە کە جاری پێشو ئەوسودەم نەبینیوە.**

**(طبقات الشافعية الكبرى (٢/٩٩))**

٢٧٩/ عَبْدُاللَّهِ كوڕي ئیمامی احمد فه‌رموویه‌تی رحمه الله
باوكم هه‌موو حه‌فتان دوو خه‌تمی ده‌كرد خه‌تمێكیان به‌شه‌و خه‌تمێكیان به‌ڕۆژ.

(طبقات الحنابلة (٩/١)

٢٨٠/ پرسیار له مالیکی كوڕی ئه‌نه‌س كرا رحمه الله
ئایه له ڕشانه‌وه ده‌ستنوێژ ده‌شورێ؟

فه‌رمووی نا به‌ڵام غه‌رغه‌ره ده‌كا و ده‌می ده‌شوا وه ده‌ستنوێژی له‌سه‌ر نیه.

(الموطأ مالك بن أنس)

٢٨١/ ئیمامی شافعي ده‌ڵێ رحمه الله
هه‌ركه‌سێك ده‌یه‌وێت الله تعالی دڵ و ده‌روونی بكاته‌وه و ڕووناكی بخاته دڵیه‌وه با باس له شتێك نه‌كات كه په‌یوه‌ندی پێوه نیه.

(مناقب الشافعي للبيهقي ( ٢ / ١٧١ )

٢٨٢/ أبو علي الحسين كوڕی عبد الله الخرقي ده‌ڵی

شه‌ویک له‌گه‌ڵ احمد بن حنبل مامه‌وه بینیم كه به‌س ده‌گری
به‌یانی ووتم ئه‌ی باوكی عبدالله بۆ چی حاڵت ئاوا بوو شه‌و ؟

**فەرمووی بیری جەڵد لێدانەکەی معتصم دەکردەوە کە لە زیندان زیاتر لە ٣٠٠ جەڵدم لێ درا بە ناحەق و ئەمڕۆ لە ووانە ووتنەوەکەم ئەم ئایەتەم دەخویند**

**{وجزاء سيئةٍ سيئةٌ مثلها فمن عفا وأصلح فأجره على الله}**

**بۆیە سوجدەم برد و لە  سوجدەکە لێی خۆش بووم.**

**(مناقب الإمام أحمد لابن الجوزي ٤٦٧)**

**٢٨٣/ ئیمام مالیك وتی**

**کەس لە پشتی خۆت هەڵمەگرە و مەهێڵە خەڵکی توانای هەبێ بەسەرتدا ئەوەی بیستت تەنها خۆت پێیەوە هەڵبەستە و بەهیچ شێوەیەک جوێن بە خەڵکی مەدە کاریگەری دەمێنێتەوە.**

**(ذم الكلام)**

**٢٨٤/ ئیمامی شافعي دەڵێ**

**هەرکەسێک دەیەوێت الله تعالی دڵ و دەروونی بکاتەوە و ڕووناکی بخاتە دڵیەوە با باس لە شتێک نەکات کە پەیوەندی پێوە نیە.**

**(مناقب الشافعي للبيهقي ( ٢ / ١٧١ )**

**٢٨٥/ بە ئیمامی احمدیان ووت فەقیهـ چەند فەرمودەی لەبەر بێ ئەتوانێ فەتوا بدات ؟**

**ئایا ١٠٠ هەزار باشە تا فتوا بدات ؟**

**فەرمووی نەخیر**

**ئایا ٢٠٠ هەزار باشە تا فتوا بدات ؟**

**فەرمووی نەخیر**

**ئایا ٣٠٠ هەزار باشە تا فتوا بدات ؟**

**فەرمووی نەخیر**

**ئایا ٤٠٠ هەزار باشە تا فتوا بدات ؟**

**فەرمووی نەخیر**

**ئایا ٥٠٠ هەزار باشە تا فتوا بدات ؟**

**فەرمووی پیم وایە باشە**

**(الخطیب البغدادي في الفقیه والمتفقه ٢/٣٤٩)**

**٢٨٦/ یحیی بن خلف بۆی باسکردین وتی لەلای ئیمامی مالیک بووم جا پیاوێك پێی وت ئەی أبو عبدالله چی دەڵێی دەربارەی پیاوێك بڵێت قورئان مەخلوقە.**

**مالك بن أنس وتی بیکوژن کافرە.**

وتی ئه‌ی أبو عبدالله من وام نه‌وتووه من وتم كه‌سێك وا ده‌ڵێت (واته من نه‌موتوه قورئان مه‌خلوقه وتومه كه‌سێك وا ده‌ڵێت)

**مالك** بن أنس وتی من له تۆوه گوێم لێی بووه.

(اللالكائی٢٦٢ )

٢٨٧/ پیاوێک پرسیاری له ئیمامی **شافعی** كرد وتی ئه‌ی باوكی عبدالله كامه‌ی باشتره بۆ پیاو جێگیر بێت یاخود تووشی تاقیكردنه‌وه بێت؟

ئیمامی **شافعی** فه‌رمووی

جێگیربون نایه‌ت ئیللا له‌پاش تاقیكردنه‌وه نه‌بێت چونكه الله نوح و إبراهیم وموسیٰ وعیسیٰ ومحمد سه‌لات و سه‌لامی اللهیان لێبێت هه‌موویان تاقیكرده‌وه كه ئارامیان گرت ئینجا الله جێگیربوونی پێ به‌خشین.

(جامع المسائل لابن تیمیة (٣/٢٥٤))

٢٨٩/ ئیمامی **احمد** ده‌ڵێ

ئه‌گه‌ر پیاو هاوڕێ ودۆسته‌كانی بمرن ئه‌وه بێ كه‌س وكه‌ساد ده‌بێت.

(طبقات الحنابلة ٢ / ٣٦)

٢٩٠/ محمد بن بُندار السبَّاك الجُرجاني ده‌ڵێ ووتم به‌ ئیمامی أحمد رحمه الله

ئه‌ی ئیمام زۆر قورسه‌ له‌سه‌رم بڵێم فلان كه‌س لاوازه‌ یان درۆزنه‌ ئیمام احمد رحمه الله فه‌رمووی تۆ بێده‌نگ بیت و من بێده‌نگ بم ئه‌ی كه‌سی جاهیل كه‌ی ڕاست له‌ هه‌ڵه‌كه‌ جیابكاته‌وه‌.

( جامع لخطیب البغدادی مجلد الثانی صـ ٤٤١ )

٢٩١/ پیاوێ به‌ مالیكی كوڕی ئه‌نه‌سی ووت ئه‌ی باوكی عبدالله ئایا ئیمانداران له‌ ڕۆژی قیامه‌ت په‌روه‌ردگار ئه‌بینن..؟

فه‌رمووی ئه‌گه‌ر ئیمانداران په‌روه‌ردگاریان نه‌بینیایه‌ له‌ ڕۆژی قیامه‌ت ئه‌وه‌ خودا ڕێگری نه‌ئه‌كرد له‌ كافران به‌ حیجاب به‌ربه‌ست فه‌رموویه‌تی ( كَلَّا إِنَّهُمْ عَنْ رَبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونَ )

او موسی الانصاری به‌هه‌مان شێوه‌ به‌ زیاده‌یه‌كه‌وه‌ وتی ئه‌ی باوكی عبدالله كه‌سانێ وا گومان ده‌به‌ن الله تعالی نابیندرێ مالک رحمه الله فه‌رمووی شمشێر شمشێر.

(اللالكائی٧٦١)

٢٩٢/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ

به‌رزترین كه‌س له‌ناو خه‌ڵک ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ له‌خۆ بایی نیه‌ وه‌ چاكترین كه‌س ئه‌و كه‌سه‌یه‌ كه‌ چاكی خۆی نابینێ.

(سير أعلام النبلاء (١٠/٩٩))

**٢٩٣/ أبو داود ده‌ڵێ**

**پێم ناژمێردرێ كه چه‌ن جار گوێم له أحمد بووه پرسیاری لێ ده‌كرا له زۆربه‌ی ئه‌و بابه‌تانه‌ی ڕاجیاوازی له‌سه‌ره له زانست دا ده‌یوت نازانم.**

**[مسائل أبي داود : ١٧٨٧]**

**(وشه‌ی لا ادری (نازانم) له‌لای سه‌له‌ف به‌شێک بووه له عیلم چونكه قه‌ت له‌خۆڕا وه‌ڵامیان نه‌داوه‌ته‌وه ابن مسعود ده‌ڵێ ئه‌و كه‌سه شێته كه له هه‌موو بابه‌تێكدا فه‌توا ئه‌دات)**

**٢٩٤/ المزني ده‌ڵێت الشافعي پێی ووتم**

**گه‌نجێكم بینی له به‌غداد**

**كاتێک بیوتایه حدثنا**

**هه‌موو خه‌ڵكی ده‌یان ووت**

**ڕاسته‌كه‌یت**

**ووتم كێ بوو ئه‌و كه‌سه؟**

**ووتی أحمد بن حنبل.**

**[سير أعلام النبلاء:١١/١٩٥]**

**٢٩٥/ حه‌ز به‌وه مه‌كه الله تعالى به هۆی تۆوه كه‌سێک سزا بدات**

**شيخ الاسلام أحمدی كوڕی حنبل فه‌رمويه‌تی**

چی سودێكت پێ ده‌گات به‌هۆی تۆوه‌ خوای به‌رز براكه‌ت سزا بدات؟
(یانی لێی خۆش ببه‌و گه‌ردنی ئازا بكه‌)

(سیر أعلام النبلاء ١١/٢٦١ )

٢٩٦/ صالح ـی كوڕی ئیمامی احمد ده‌ڵێ
پیاوێك كه‌ له‌ میحنه‌ی ئیمامی احمد ئاماده‌بوو پێی وتم
له‌و سێ ڕۆژه‌دا له‌ ئیمامی احمد ـم ده‌كۆڵیه‌وه‌ كاتێ جه‌همییه‌كان گفتوگۆ و قسه‌یان له‌گه‌ڵدا ده‌كرد له‌هیچ وشه‌یه‌كدا هه‌ڵه‌ی نه‌كرد و پێم وانه‌بوو هیچ كه‌سێ وه‌ك ئه‌و ئازاو دڵ به‌هێز بێ.

(الإبانة الكبرى ٢٥١٦)

٢٩٧/ عبدالوهاب الوراق ده‌ڵێ هیچ كه‌سێكم نه‌بینیوه‌ وه‌ك ئیمامی احمدیـ كوڕی حنبل

پێیان ووت به‌چ شتێك له‌لای تۆ
له‌ فه‌زڵ و عیلمی؟!

ووتی پیاوێك بوو پرسیاری ٦٠ هه‌زار مه‌سه‌له‌ی لێ كرا

جوابی هه‌ر هه‌موویانی به‌ (حدثنا ، اخبرنا) دایه‌وه‌.

( طبقات الحنابلة ١/١٣ )

**٢٩٨/ وەلید بن مسلم  دەڵێ پرسیارم لە ئیمام مالیک کرد**

**دەربارەی ئەو فەرموودانەی کە باسی بینی الله تعالی ی تێداکراوە ئەویش فەرموو بەسەریدا برۆ وەک چۆن هاتووە  بەبێ باسکردنی چۆنیەتیەکەی.**

**(اللالکائی٨٧٥)**

**٢٩٩/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئەگەر هەموو هەوڵ و کۆششی خۆت بدەی بۆ ڕازی کردنی خەڵک لە خۆت هیچ ڕێگایەک نیە بۆ ڕەزامەندیان جا ئەگەر وا بوو کار و نیەتت بۆ پەروەردگار خاڵس بکەوە.**

**(کتاب مناقب الشافعي (٢/١٧٣))**

**٣٠٠/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**وە هیچ شتێک نییە لەکردەوەکان وازهێنانی کوفر بێت جگە لەنوێژ نەبێت ئەوەی وازی لێ بینێت کافرە وە الله تعالی کوشتنی حەڵاڵ کردووە.**

**(الجامع في عقائد ورسائل أهل السنة(٢٢))**

**٣٠١/ عبداللەیـ کوڕی احمد رحمه الله دەڵێ**

**پرسیارم لە باوکم کرد دەربارەی ئەو کەسەی وازی لە نوێژ کردن هێناوە ئیمامی احمد فەرمووی بەم شێوەیە لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم ریوایەت کراوە نێوان بەندە وکوفر وازهێنانە لەنوێژ.**

**(أحكام أهل الملل (١٣٦٩))**

**٣٠٢/ احمدیـ کوڕی الحسین کوڕی حسان دەڵێ**

**پرسیار لە ئیمامی احمد کرا دەربارەی ئەو کەسەی کە بە ئەنقەست وازی لەنوێژ کردن هێناوە فەرمووی**

**هیچ شتێک نییە نێوان ئیمان و کوفر ئیلا وازهێنان لەنوێژ نەبێت.**

**(أحكام أهل الملل للخلال (١٣٧١))**

**٣٠٣/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**ئەمان بیستووە هیچ شتێک لە کردەوەکان وازهێنانی کوفر بێت جگە لە نوێژ نەبێت.**

**(أحكام أهل الملل للخلال (١٣٧٢))**

**٣٠٤/ ئەبو داود دەڵێ گوێم لێ بوو ئیمام احمد دەیوت**

**ئەگەر ئینسان بڵێت نوێژ ناکەم ئەوە کافرە.**

**((أحكام أهل الملل للخلال (١٣٧٧))**

**٣٠٥/ ئیمامی احمد لە دوعاکانیدا دەیفەرموو**

**یا رب چۆن ڕوخسارمت پاراستووە لە سوجدە بردن بۆ غەیری تۆ ئاواش بیپارێزە لە داواکاری وتەکلیف کردن لە غەیری خۆت.**

**(مجموع رسائل ابن رجب مـ ٣ , صـ ١٢٣)**

٣٠٦/ ئیمامی **مالیک** وتی

مشتومڕ له زانستدا دڵ ڕه‌ق ده‌كات وه ڕقو كینه‌ش جێده‌هێڵێت.

(الرد على المبتدعه)

٣٠٧/ ئیمامی **شافعی** ده‌ڵێ

موسڵمانان یه‌كده‌نگن له‌سه‌ر ڕێگری كردن له ژنان له سفووری.

(روضة الطالبين (٥/٣٦٦))

٣٠٨/ عبدالله ی كوری ئیمام **احمد** ده‌ڵێ

پرسیارم له‌باوكم كرد ده‌رباره‌ی گۆرانی

ووتی نیفاق و دووروويي له دڵ دا جێگیر دةكات بۆیه خۆشم ناوێت.

(مسائل أحمد بن حنبل رواية ابنه عبد الله صـ (٣٠٦)

٣٠٩/ یحیی كوڕی معین ده‌ڵێ

هیچ كه‌سێكم نه‌دیوه وه‌كو ئیمامی **احمدی** كوڕی حنبل بێت په‌نجا ساڵ هاوڕێیه‌تیمان كرد هه‌رگیز فه‌خری به‌سه‌رمانه‌وه نه‌ده‌كرد به‌هیچ شتێک به‌ڵكو ده‌یفه‌رموو ئێمه قه‌ومێكی هه‌ژارین ئه‌گه‌ر ستری الله نه‌بێت ئه‌وا تووشی ئابڕو چون ده‌بین.

(حلية الاولياء ١٨١)

**٣١٠/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**هەر کەسێك ڕزگاری دەوێت با دەست بگرێ بە قورئان و سوننەتی رسول الله ﷺ.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٤)**

**٣١١/ رسول الله ﷺ دەفەرموویت**

**من زامنم بەماڵێک لە خوارەوەی بەهەشت بۆ ئەو کەسەی وازبێنێ لە مشتومڕی ئەگەر لەسەر حەقیش بوو.**

**ئیمامی شافعی دەڵێ**

**مشتومڕیم لەگەڵ هیچ کەسێک نەکردوە حەزم کردبێت هەڵە بکات.**

**(صفة الصفوة (٢/٢٥١))**

**٣١٢/ ابو النضری العجلی دەڵێ**

**گوێم لە احمد بن حنبل بوو دەیفەرموو هەر کەسێک بڵێت{پێی وابێت} کەوا الله قسە ناکات ئەوە کافرە**

**(کتاب السنة لغلام الخلال )**

**٣١٣/ حنبل دەڵێ گوێم لە ئیمامی احمد بوو دەیوت**

**هەر کەسێک پێی وابێت الله قسەی لەگەڵ موسا نەکردووە ئەوە کافرە بە الله وە قورئانی بە درۆ خستۆتەوە وە ئەمری رسول الله ی ڕەتکردۆتەوە تەوبەی پێدەکرێت لەسەر**

**گووتنی ئەم قسەیە ئەگەر تەوبەی کرد لێی دەگەڕێین ئەگەرنا لە ملی ئەدەین.**

**( كتاب السنة لغلام الخلال )**

**٣١٤/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**ئەگەر پیاو گوتی زانستی الله دروستکراوە ئەوە کافرە لەبەر ئەوەی وا گومان دەبا سەرەتا زانستی نەبووە تا دروستی کرد(واتە نەزانی ئەداتە پاڵ الله).**

**(السنه عبدالله بن احمد ٢)**

**٣١٥/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**هەر کاتێك شوێنەواری رسول الله ﷺ و هاوەڵان و تابعین کەم بویەوە لەناو خەڵکدا ئیلا هەواو ئارەزوو بڵاو دەبێتەوە وە هەر کاتێك زانایان کەم بوونەوە لەناو خەڵکی ئیلا پشت کردن لە دین ڕوئەدا.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ١٢)**

**٣١٦/ ئیمامی شافعی لە دەربارەی جوولەکە و گاورەکان دەڵێ**

**وە نابێ لە وڵاتێک لە وڵاتەکانی موسڵمانان کەنیسە دابنرێت وە شوێنێک لەبۆ نوێژەکانیان وە دەنگی ناقوسەکانیان.**

**(كتاب الأم للشافعي (٤/٢١٨))**

٣١٧/ ئیمامی **احمد** دەڵێ

درۆزن ترینی خەڵکی سواڵکەر و چیرۆک بێژەکانن.

(أبو طاهر السِّلَفي المشيخة البغدادية لأبي طاهر السلفي - مخطوط، ٤٣/١)

٣١٨/ ئیمامی **احمد** دەڵێ

هیچ کەسێک بۆی نیە لەگەڵ ئەهلی بیدەع دانیشێ و تێکەڵاوییان بکات و پێ یانەوە هۆگر ببێت.

(الإبانة لابن بطة)

٣١٩/ ئیمامی **مالیک** دەڵێ

کەسی زانا سوننەت بڵاو دەکاتەوە مشتومڕ و مناقەشە ناکات جا ئەگەر خەڵك سونەتیان لێی وەرگرت سوپاسی الله تعالی دەکات ئەگەر وەریان نەگرت بێ دەنگ دەبێ.

(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ١٤)

٣٢٠/ الربيع ـی کوڕی سلیمان دەڵێت

گوێم لە **شافعی** بوو دەیفەرموو هاوڕێیەتی کەسی بێ شەرم شەرمەزاریە لە قیامەتدا.

(الإبانة الكبرى لإبن بطة العُكْبَرِيّ (١/١٧٣))

**٣٢١/ ئیمامی احمد دەیوت لە دوعاكەید**

**یا رب چۆن ڕوخسارمت پاراستووە لە سوجدە بردن بۆ غەیری تۆ ئاواش بیپارێزە لە داواكاری وتەكلیف كردن لە غەیری خۆت.**

**(مجموع رسائل ابن رجب مـ ٣ , صـ ١٢٣)**

**٣٢٢/ هارون بن عبدالله الجمال ووتی**

**ئیمامی احمد شەوێک هات بۆ لام لە درگای دا**

**ئینجا ووتم كێیە؟**

**ووتی من احمدم**

**ئینجا دەرچووم بۆ لای و چاک و چۆنی و شەو باشمان كرد ئینجا ووتم كارێكت هەیە ئەی أبا عبدالله؟**

**ووتی بەڵێ ئەمڕۆ دڵم هەر لات بوو**

**ووتم لەبەر چی ئەی أبا عبدالله**

**ووتی تێپەڕ بووم بەلاتدا ئەمڕۆ كە تۆ دانیشت بووی فەرموودەت بۆ خەڵكی باس دەكرد لە سێبەر بوویت خەڵكیش لەبەر خۆر قەڵەم و دەفتەریان بە دەست بوو جارێكی تر وا مەكە**

**ئەگەر دانیشتیت لەگەڵ خەڵكی دابنیشە..!**

**(الجامع لأخلاق الراوي للخطيب البغدادي: ١ / ٤١١)**

**٣٢٣/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**نەخۆشی کوشندە بریتیە لە بیرورِا گۆرِین.**

**(هەر رِۆژێ لەسەر بیرو بۆ چونێک بی ئەمە نەخۆشی کوشندەیە)**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ١٨)**

**٣٢٤/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**(باس کردنی ئەهلی بیدعە بە غەیبەت ناشێ)**

**(طبقات الحنابلة (٢/٢٧٤)**

**٣٢٥/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**نیە بۆئافرەت باشتر بێت لە پیاوێک وە بۆ پیاویش نیە بۆی باشتر بێت لەئافرەتێک.**

**(الورع للإمام أحمد ١٢٨)**

**٣٢٦/ الربیع ی کوری سلیمان المُرَادِي دەڵێت**

**گوێم لە ئیمامی شافعی بوو دەیفەرموو**

**ئەگەر لە کتێبم پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرتان ﷺ دۆزیەوە بەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ کار بکەن وە وازبێنن لەقسەی من.**

**(كتاب مناقب الشافعي (١/٤٧٢))**

**٣٢٧/ ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێ**

**هەر کەسێك لە الله تعالى بترسێت الله ﷻ دەرگای خێری بۆ دەکاتەوە لەم هەواو ئارەزوانە دەری ئەهێنێت.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ١٩)**

**٣٢٨/ پیاوێـک بە ئیمامی احمدی ووت سوننی کێیە**

**ئەویش ووتی تۆ لەکوێیت ئەوەیش ووتی بەصرە**

**ئیمام فەرمووی أیوب السختیانیت خۆش دەوێـت ؟**

**ئەویش ووتی بەڵێ**

**ئیمام احمد ووتی تۆ سوننیت.**

**(ذم الكلام وأهله ١١٣/٥ )**

**(دەڵێم هەرکەسێـکت بینی کتێبەکانی سەلەفی خۆش دەوێت وە لەسەر مەنهەجیان ئەڕوات ئەوە سونیە).**

**٣٢٩/ ئیامی احمد دەڵێ**

**سەلامەتی لە ١٠ شتایە هەر ١٠ یەکەی بریتیە لەلەبیرکردنی ئەوشتانەی کە خەڵک کردویانە بەرامبەرت.**

**(البيهقي في كتابه شعب الإيمان ١٥/٥٧٥)**

**٣٣٠/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**هەرکەس پۆشاکی پاک بکاتەوە خەمی کەم دەبێتەوە وە هەر کەسێک بۆنی خۆش بێت عەقڵی فراوانتر دەبێت.**

**(صفة الصفوة (٢/٥٣٢١))**

**٣٣١/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**ئیمان زیاد دەکات سنورێکی نیە تاکۆتایی بێت هەر گیز.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٢٥)**

**٣٣٢/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**کاتێک منیان خستە سەر زەویەکەو جەلادەکان هاتن (بۆ لێدانی) دزێک هات و قسەیەکی چرپاندە گوێم و وتی**

**ئەی احمد لە الله تعالی بترسە و سەبر بگرە ئەوان ئەیانەوێ توشی باتڵ و گومڕایی ببی سەبر بگرە چونکە تۆ لەسەر حەقی من دزیم کرد و لێ یان دام ویستیان دانی پێ دا بنێم بۆیان کەچی من لەسەر باتڵ بووم جا تۆ چۆن بۆیان دان پێ دا ئەنێی لە کاتێکدا خۆت لەسەر حەقی.**

**(مناقب أحمد لأبن الجوزي٤٢٢)**

**٣٣٣/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**من هەموو بەیانی و ئێوارەیەک تەمەنناى مردن ئەکەم ئەترسم تووشی فیتنە و تاقیکردنەوە بم بەهۆی دونیاوە.**

**(الورع للمروذي ١٦)**

**٣٣٤/ ئیمام مالیك دەڵێ**

**کەس نەڵێت من ئیمانم کاملە ئیمانی من وەك ئیمانی جبرائیل و میکائیل و فریشتە نزیکەکانە چونکە ئەمە وتەی مورجیئەکانە.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٢٧)**

**٣٣٥/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**چاکەکردن لەگەڵ دایک و باوکا تاوانە گەورەکان ئەسڕنەوە.**

**(الأداب الشرعية)**

**٣٣٦/ هارون کوڕی سعید کوڕی الهیثم الأَيْلِ دەڵێ**

**هەندێک لە فەقیهەکانی میصر چوونە لای ئیمامی شافعی لەکاتی بەرەبەیانی قورئان لەنێو دەست بوو فەرمووی**

**فیقھ سەرقاڵی کردوونە لەخوێندنەوە قورئان من نوێژی عیشا دەکەم وە قورئانەکەم دادەنێم لەنێو دەستم دایناخەم تاکو بەیانی.**

**(کتاب مناقب الشافعي (١/٢٨١))**

**٣٣٧/ ئیمامی مالیك دەڵێ**

**هیچ یەکێك لە موەحیدان تەکفیر ناکەین لەبەر ئەنجامدانی گوناح و تاوان.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٣٠)**

**٣٣٨/ صالحی كوڕی ئیمامی احمد ده‌ڵێ گوێم له باوكم بوو ده‌یووت**

**جه‌همیه‌كان دابه‌ش بوون بۆ سێ كۆمه‌ڵه**

**١/ كۆمه‌ڵه‌یه‌ك وتیان قورئان مه‌خلوقه**

**٢/ وه كۆمه‌ڵه‌یه‌ك وتیان كه‌لامی الله یــه و بێده‌نـگ بوون**

**٣/ وه كۆمه‌ڵه‌یه‌ك وتیان له‌فزمان به قورئان مه‌خلوقه.**

**(الرد على المبتدعة)**

**٣٣٩/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**ئـه‌گه‌ر پیاو ئافره‌تێكی خواست با یه‌كه‌م شت كه‌پرسیاری بۆبكات جوانی ئافره‌ته‌كه‌بێت ئـه‌گه‌ر به‌دڵی بوو با پرسیار له‌دینی ئافره‌ته‌كه بكات ئـه‌گه‌ر به‌دڵی بوو با هاوسه‌رگیری له‌گه‌ڵ بكات به‌ڵام ئـه‌گه‌ر به‌دڵی نه‌بوو با ڕه‌تی بكاته‌وه له‌به‌ر دینه‌كه‌ی**

**با یه‌كه‌م شت كه‌پرسیاری بۆ ده‌كات دینه‌كه‌ی نه‌بێت، ئـه‌گه‌ر به‌دڵی بوو پرسیار له‌جوانیه‌كه‌ی بكات و به‌دڵی نه‌بێت و ڕه‌تی بكاته‌وه له‌به‌ر جوانیه‌كه‌ی{كه‌به‌دڵی نیه}.**

**(الإنصاف للمرداوي_١٢_٢٠٦)**

**٣٤٠/ ئیمامی خۆشه‌ویست مالیک ده‌ڵێ**

**شاهێدی نادەین بە بەهەشتی بوونی هیچ کەسێك بەهۆی کرداره باشه‌کانی.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس٣٢)**

**٣٤١/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**دەست بگرن بە سوننەت دەست بگرن**

**بە ئەثەر دەست بگرن بە حەدیث.**

**(طبقات الحَنابِلة)**

**٣٤٢/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**هیچ کەس نیە ئیللا خۆشەویست و دوژمنی هەیە، ئەگەر هەر دەبێ وابێت با مرۆڤ لەگەڵ ئەهلی تاعەت و عیبادەتی پەروەردگار بێت.**

**(حلية الأولياء (٨/١١٧))**

**٣٤٣/ ئیمامی مالیك ده‌ڵێ**

**قورئان کەلامی الله تعالی یە لە خواوە هاتوە وە هیچ شتێکیش لە الله تعالی وە دەرچێت درووست کراو نیە هەر کەسێك بڵێت قورئان مەخلوقە کافرە بە الله تعالی.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٣٣)**

**٣٤٤/ ابن البناء الحنبلی دەڵێ**

**بەڕاستی ئیمامی احمد تەکفیری موعتەزیلەی کردووە.**

**(الرد على المبتدعة)**

**٣٤٤/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**فەرموودەکانی صیفات چۆن هاتوە ئەوها دەیگێرینەوە بەبێ ئەوەی چۆنیەتی بۆ دیاری بکەین.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٣٥)**

**٣٤٥/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**ئەگەر پێویستەکانت زۆر بوون بە گرینگترینیان دەست پێبکە.**

**(طبقات الشافعيين لابن كثير (١/٣٠))**

**٣٤٦/ منصور الکوسَج دەڵێ بە أحمد بن حنبل ـ رحمه الله ووت**

**پاداشت وەردەگرین بەڕق لێ بونەوەمان لە أبو حنيفة و هاوەڵەکانی؟**

**ووتی ئەرێ والله**

**(كتاب السنة عبدالله:٢١٤)**

**٣٤٧/ ئیمامی مالیک دەڵێ الله تعالى لەگەڵ موسا قسەی کرد.(لە کێوی طور)**

**(اعتقاد الإمام ماليك بن أنس ٤٠)**

**٣٤٨/ المزني دەڵێت گوێم لە شافعی بوو دەیفەرموو**

**سەخی بوون و بەخشین عەیبی دونیا و دوارۆژ دادەپۆشن بەمەرجێک بیدعە لەدوا نەبێت.**

**(طبقات الشافعيين لابن كثير (١/٢٥))**

**٣٤٩/ ئیمامی احمد دەڵێ**

**سەردەمێک بەسەر خەڵکیدا دێت سینەیان لە قورئان خاڵی دەبێت و هیچ هەست بە لەزەت و شیرینی خوێندنەوەی ناکەن ئەگەر کەمتەرخەمی بکەن لە بەرامبەر فەرمانەکانی خودا دەڵێن**

**خوا لێ بوردە و بە سۆزە**

**جا ئەگەر حەرامەکانیش بکەن دەڵێن گرنگ ئەوەیە شەریکمان بۆ خوا دانەناوە خوا لێمان خۆش دەبێت**

**کارەکانیان تەنها ئومێد و خۆزگەیە هیچی ڕاستی تێدا نییە.**

**(الزهد لأحمد (١٧٦٠))**

**٣٥٠/ ئیمامی مالیک دەڵێ تەرازوی قیامەت حەقە.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٤١)**

**٣٥١/ موزەنی ئەڵێت بیستم شافعی ئەیووت**

**هیچ قەومێک نییە لە کاتی زەواجدا ڕێبدەن ئافرەتەکانیان بڕۆنە ڕیز و کۆبوونەوەی پیاوان وە پیاوانیان بڕۆنە ڕیز و کۆبونەوەی ئافرەتەکان ئیللا ئەو منداڵانەی ئەیخەنەوە ئەحمەق دەرئەچن.**

**(آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم١٣١)**

٣٥٢/ پرسیار کرا لە ئیمامی احمد کە دەربارەی چونە دەرەوەی ئافرەتان بۆنوێژی جەژن

فەرموی خەڵکی توشی فیتنە ئەبێت ئیلا ئافرەتانێک نەبێ کە چونەتە تەمەنەوە.

(جائیز نیە ئافرەتەکان نزیکی پیاوان ببنەوە)

(الفروع لابن مفلح)

٣٥٣/ ئیمامی مالیک دەڵێ

هەر قەدەریەك بڵێت الله تعالی نەیئەزانی بەندەکان چی ئەکەن تابەندەکان کارەکە ئەنجام نەدەن ئەوە داوای تەوبەیان لێ دەکرێ ئەگەر تەوبە نەکەن لە ملیان ئەدرێت.

(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٥٠)

٣٥٤/ پێشەوا الربیع ـی کوڕی سلیمان المرادي دەڵێت

پیاوێک هات بۆلای شافعی بۆ ئەوەی مونازەرەی لەگەڵ بکات لەسەر شتێکدا فەرمووی وازی لێبێنە ئەمە ڕێگای ئەهلی کەلامە موبتەدیعەکان.

دەڵێت وە ئیمامی شافعی گوێی لە دوو پیاو بوو قسەیان ئەکرد لەسەر عیلمی کەلام فەرمووی یان ئەوەیە بەخێر لەلای ئێمە دانیشن یان ئەوەیە لەلای ئێمە نەمێنن.

(الإبانة الكبرى لإبن بطة (١/٢١٧))

٣٥٥/ ئیمامی مالیك دەڵێ

**هەر کەسێك جوێن بدات بەیەکێ لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ جوێن بدات بە ابو بکر یان عمر یان عثمان یان معاویە یان عەمری کوڕی عاص**

**ئەگەر بڵێت ئەوانە لەسەر گومڕایی و کوفر بوونە ئەوە دەکوژدرێت ئەگەر جوێنیان پێ بدات بەڵام نەڵێ لەسەر کوفرو گومڕایی بوونە ئەوە بە توندی سزا ئەدرێت.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٥٩)**

**٣٥٦/ ئیمامی شافعی دەڵێ**

**موسڵمانان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک سوننەتی رسول الله ﷺ بۆ دەرکەوت بۆی نیە لادات بۆ قسەی هیچ کەسێکی تر لە خەڵک.**

**(کتاب الرسالة للشافعي (١٠٤))**

**٣٥٧/ سلمه بن شبيب وتی لای ئیمامی احمد بووین**

**پیاویك هات وتی ئیمامی احمدی کوڕی حنبل لە کوێیە؟**

**ئینجا بردیان بۆلای ئیمامی احمد پێی ووت دوێنێ خضر هاتە خەونم ووتی**

**بڕۆ بۆلای احمدی کوڕی حنبل پاشان پێی بڵێ الله تعالی لێت ڕازیە وە هەڵگرانی عەرشو دانیشتوانی ئاسمانەکانیش لێت ڕازین.**

**(الرد على المبتدعة)**

**٣٥٨/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**هیچ یەکێ لەم بیدعانە لە سەردەمی رسول الله ﷺ و ابو بکر و عمر و عثمان نەبووە.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٧٢)**

**٣٥٩/ إسحاق کوڕی راهویە دەڵێ**

**نامەم نارد بۆ احمد کوڕی حنبل داوام لێکرد لە کتێبەکانی ئیمامی شافعی شتێکم بۆ بنێرێ هەتا پێداویستی عیلمی خۆمی پێ پڕ بکەمەوە ئەویش کتێبی الرسالەی شافعی بۆ ناردم.**

**(آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم ٣٩)**

**٣٦٠/ وترا بە ئیمامی احمد کوڕی حەنبەل**

**الله تعالی لەسەروو حەوت ئاسمانەوەیە لەسەر عەرشەکەی وە زانستی لە هەموو شوێنێکە ؟ ووتی بەڵێ لەسەر عەرشەکەیەتی وە هیچ شوێنێک لە زانستی ئەو خاڵی نابێت.**

**(الإبانة الکبری ٢٦٩٧)**

**٣٦١/ ئیمامی مالیک دەڵێ**

**هیچ یەکێ لەم بیدعانە لە سەردەمی رسول الله ﷺ و ابو بکر و عمر و عثمان نەبووە.**

**(اعتقاد الإمام مالك بن أنس ٧٢)**

**٣٦٢/ ئیمامی شافعی ده‌ڵێ**

**ئه‌ی ڕه‌بیع ده‌ست بگره‌ به‌ زوهد (دونیا نه‌ویستی) چونكه‌ به‌ڕاستی زوهد له‌سه‌ر كه‌سی دونیا نه‌ویست جوانتره‌ له‌ زێر و زیو له‌سه‌ر ئافره‌تێكی ته‌مه‌ن بچووك.**

**(حلية الأولياء (٩/١٣٠))**

**٣٦٣/ ئیمامی احمد ده‌ڵێ**

**سه‌رسامی كه‌سێک نیم كه‌وا تێكه‌ڵی مورجیئه‌ بێت.**

**(السنه حرب الكرمانی ٢٠٥)**

**٣٦٤/ ئیمامی مالیك ئه‌فه‌رمووێت**

**كۆتایی ئه‌م نه‌ته‌وه‌یه‌ باش نابێت ته‌نها به‌وه‌ نه‌بێت كه‌ سه‌ره‌تاكه‌ی پێ باش بوو**

**وه‌ ئه‌وه‌ی سه‌ره‌تاكه‌ی پێ باشكرد قورئان و سوننه‌ت بوو جا به‌ هیچ جۆرێ كۆتایه‌كه‌شی باش نابێت ئیلا به‌ قورئان و سوننه‌ت نه‌بێ.**

**(تمهيد ١٥/٢٩٢)**

**٣٦٥/ الله تعالى ده‌فه‌رمووێت ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ [سورة الذاريات: ٥٦]**

**﴿وه‌ من جن و مرۆڤم دروست نه‌كردووه‌ ته‌نها بۆ ئه‌وه‌ نه‌بێ به‌ تاك و ته‌نها بمپه‌رستن وه‌ ملكه‌چی فه‌رمانی من بن﴾**

ئیمامی شافعی لە تەفسیریدا دەڵێ

پەروەردگار دروستکراوەکانی دروست کردوە بۆ عیبادەتی.

(كتاب الأم للإمام الشَّافعي (٤/١٥٩)

٣٦٦/ پرسیاریان لە ئیمامی احمد کرد دەربارەی ئیمان

وتی ووتە و کردەوە و نیەتە

وتیان ئەی پیاوێک بڵێ تۆ ئیماندارى ؟

ئیمام احمد ووتی ئەمە بیدعەیە. ( کردنی ئەم پرسیارە بیدعەیە.

(اللالكائى ١٦٢٧)

٣٦٧/ رسول الله ﷺ دەفەرموویێت

سەیری ئەو کەسانە بکەن کە لە خوارەوەی ئێوەن (لە نیعمەت) و سەیری سەرو خۆتان مەکەن چونکە گونجاوترە کە سووکایەتی بە نیعمەتی پەروەردگار نەکەن.

ئیمامی شافعی دەڵێ

خەڵک سەیری شتێک ناکەن کە لەوان کەمتر بێت ئیللا زمانیان تێدا درێژ دەکەن.

(حلية الأولياء (٤/٩٩))

لەم کتێبە ووتەکانی ئەم سێ ئیمامە بەڕێزە کۆتایان پێهات إن شاء الله سودم گەیاندوە الله تعالى لێمان قبووڵ بکات دامەزراومان بکات لەسەر سوننەت و ڕێگا ڕاستو چاکەکە.

**( دەریای سەلەف)**

٢٠٢٣/١/١١